# داستانی یاوەران

## بەشی شەشەم

نووسینی : باوکی عبداللە

# داستانی یاوه ران

## به شی شه شه م

نووسینی : باوکی عبدالله

# (١٠١)

# عەبباس كوڕی عبدالمطلب

**هیجرەتی تۆ ئەی مامە كۆتا**
**هیجرەتە هەروەك پێغەمبەرایەتی من**
**كۆتا پێغەمبەرایەتییە**

پێغەمبەری خوا ﷺ

# ﴿١٠١﴾
# عەبباس كوڕی عبدالمطلب
## هیجرەتی تۆ ئەی مامە كۆتا هیجرەتە ، هەروەك پێغەمبەرایەتی من كۆتا پێغەمبەرایەتیە

پێغەمبەری خوا ﷺ

عبدالمطلب باپیرەی پێغەمبەرمان ﷺ پاش ئەوەی باوكی (مطلب) دەمرێت كاروباری مەككە دەگرێتە دەست و دەبێت بە گەورەی مەككە ، ئەو (عبدالمطلب)ەی كەوا لە جوانترین گەنجانی مەككە و پیاوە سەخیەكان دەبێت ، ڕۆژێكیان عبدالمطلب گوێبیست دەبێت بە بنەماڵەیەك كەوا لە شاری مەدینە دێن بۆ مەككە ئافرەتێكیان لەگەڵ دەبێت بە ناوی (فتیلە كچی جنابی عەمریە) كەوا لە بنەماڵەیەكی پادشا و خانەدان دەبێت ، باپیرەی یەكێك دەبێت لە پادشاكانی ڕەبیعە ، كاتێك عبدالمطلب بە پلەو پایەو ڕەوشتی دەزانێت بۆ خۆی دەیخوازێت و ئەویش شووی پێدەكات .

پاش چەند مانگێك (فتیلە) سكی دەبێت و پاشان كوڕێكی چاوگەش و جوان ودەموچاوسپی لێدەبێت ، عبدالمطلب زۆر كەیف خۆش دەبێت بەم هەواڵە وناوی لێدەنێت (عەبباس) .

جا بەمجۆرە عەبباس لە دایك دەبێ وهەر لەمنداڵیەوە شوێنەواری خۆشی و نیشانەی دەوڵەمەندی تێیدا ڕەنگ دەداتەوە...

پاش دووساڵ لە تەمەنی عەبباس ڕوداوێكی سەیر ڕودەدات لە شاری مەككەدا ، ئەویش كاتێك پیاوێك لە حەبەشە بەناوی ئەبرەهە كەوا ئەمیر ( فەرمانڕەوا ) دەبێ لەسەر یەمەن ،دەبینێ خەڵك لە كاتی حەجدا خۆیان ئامادە دەكەن بۆحەجی ماڵی خوا ، جاپرسیار دەكاو دەڵێ :

ئەمانە بۆ كوێ دەچن ؟

جا پێی دەڵێن :

ئەوانە لە مەككەحەجی ماڵی خوا دەكەن .

پاش ئەوەی ئەبرەهە خەونی حوشتر دەبینێت بە خەیاڵی خۆی بە نیازی ئەوەی خەڵکەکە بگەڕێنێتەوە لە حەجی ماڵی خوا کۆشـك و خانوویـەك دروسـت دەكـات ڕازاوەتـر و جوانـتر لـە (بیـت الحـرام) لـە شێوەی دروست کردنیدا ، جا چەند هۆزێك لە عەرەبەكان دێن بـۆی و خواپەرستی تیا دەكەن .

ڕۆژێکیـان پیـاوێك لـە عەرەبــەكان بــەناوی (نُفَیـل الخثعمـی) دەچێتە ناو ئەو ماڵەی ئەبرەهەو میزێك لە ناوەندی خانووەكە دەكات وپاشان هەندێك شتی بۆگەنیشی دەخاتــە نـاو، كـاتێك ئەبرەهـە بـەم كارە دەزانێت زۆر تووڕە دەبێت و دەڵێت :

بەڕاستی عەرەب ئەم كارەیـان كـردووە لـە تووڕەیـی ماڵەكـەی خۆیان ، پاشان بڕیاری تێكدانی كەعبەی ماڵی خوا دەدات .

نووسراوێك بۆ نەجاشی دەنوسێ وئەم هەواڵەی دەداتێ و پاشان داوا دەكات ئەم فیلەی بۆ ڕەوانـە بكـەن كـەوا فیلێكـی زۆر گـەورەو سەرسوڕهێنەر بووە لەكەلەش وهێزدا، ناوی ئەم فیلە (محمود) بووە، جاكاتێك لەحەرەم نزیك دەبێتەوە فەرمان دەكات كەوا هـێرش بكـەن بەســەرمەڕومالآت و وشــتری ئــەو دەوروبــەرە، ئــەوەبوو دەگەنـــە ووشترەكانی عبدالمطلب ودەیانبەن ، كاتێك عبدالمطلب بەمە دەزانێت دەچێت بۆ لای ئەبرەهە، كاتێك لێی دەچێتە ژوورەوە هەندێك خـەڵك دەیناسنەوە وئەبرەهە دەڵێت :

ئەمە كێیە ؟

ئەوانیش دەڵێن :

ئەمەگەورەی عەرەبە ولەهەمووان مەزنترە .

ئەبرەهە پێی دەڵێت:

چیت دەوێت ؟

ئەویش دەڵێت :

حوشترەكانم بـۆ بگێڕەوە ، جـا ئەبرەهـە بـە سەرسـوڕمانیەوە تەماشای دەكاو دەڵێت :

ئەوهام تێنەدەڕوانیت ! !

بەڕاستی گومانم دەبرد تۆقسەم لەگەڵ دەكەیت دەربارەی (بیت الحرام) كەوا نیشانەی پیرۆزی وگەورەییتانە.

عبدالمطلب گوتی :

حوشترەکانم بۆ بگێڕەوە ، ئەومالەی کە تۆ باسی لێوە دەکەیت پەروەردگارێکی هەیە قەدەغەت دەکات، ئینجا ئەبرەهە فەرمان دەکات حوشترەکانی بۆ بگێڕنەوە .

پاشان ئەوەبوو چەند کاتژمێرێکی نەبرد خوای گەورە چەند پۆلێك بالندەی لە ئاسمان بۆ ڕەوانە کردن کەوا هەر بالندەیەك سێبەردی لەلابوو ، دوو بەرد لەنێو پێیەکانیان ویەکێکیشیان لەناو دندوکەکانیان ، ئەوەبوو بەردەکانیان باراندە سەر سوپای دەستدرێژکەر وهەر هەموو سوپاکە لەم شوێنەدا خاپوربەخاپور بوون وله نێو چوون وله نێو ئەم خاکەدا ڕزانەوە.

هەر لەم ساڵەدا عبداللەی کوڕی عبدالمطلب کەوا لە دایکێکیتربوو کوڕێکی بوو ناویان لێنا (محمد) ﷺ ، لێرەدا عەبباس دووساڵ لە پێغەمبەرمان ﷺ بەتەمەن گەورەترە .

چەند ڕۆژگارێك بەسەرچوو ، عەبباس گەورە دەبوو وبەهێز دەبوو ، هەروەها موحەممەدی برازاشی هەر بەم جۆرە ....

پاشان ئەوەبوو پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان مام و برازادا دروست بوو .

ڕۆژێکیان کەوا عەبباس لەتەمەنی حەفت ساڵان دەبێت لەماڵەوە دەچێتە دەرەوەو بزر دەبێ ، بەبێ ئەوەی کەسوکاری بزانن جا لەم ڕێگا بۆ ئەو ڕێگا لەکۆڵانەکانی مەککە دەسوڕێتەوەو نازانێت بۆکوێ بچێت ! !

بەمجۆرە دەمێنێتەوە تاکوو شەوی بەسەردا دێت ، لە بن دیوارێك دەخەوێت ...

کەسوکاری بەدوای عەبباس دەگەڕێن و نایبیننەوە، شێت وهار دەبن ئەوەبوو لەڕۆژی یەکەم هەموو شوێنێکی بەدوادا دەکەن و نایبیننەوە ... دایکی لە هەموو کەس زیاتر خۆشی دەوێت وفرمێسکی بۆ هەڵدەڕێژێت ، جا(نەذر) دەکات ئەگەر بیبینێتەوە کەعبە بە ئاوریشم دەورە بدات .

ئەوەبوو خەڵکی مەککە هەر هەمووی بەدوای عەبباس دەگەڕان تاکوو بینیانەوەو گەڕاندیانەوە ماڵەوە .

ئەوەبوو دایکیشی بۆ نەذرەکەی بەوەفابوو ، کەعبەی بە ئاوریشم دەورەدا ، جالەبەر ئەوە دایکی عەبباس بەیەکەم کەس دادەنرێت کەوا کەعبەی بە ئاوریشم دەورەدا .

لەساڵی هەشتەمی پاش ڕووداوی فیل عبدالمطلب گیانی پاکی بە پەروەردگار سپارد ، ئەوەبوو عەبباس و پێغەمبەرمان ﷺ لەسەر لاشەکەی دەگریان .

پاش مردنی عبدالمطلب کاروباری ئاینی لە نێوان دوو کوڕ لەکوڕەکانی دابەش کرا ، ئەوەبوو ئاودانی ماڵی خودا بوو بە بەشی عەبباس ، لەم کاتەدا عەبباس لەهەموو برایەکانی بچوکتربوو ، ئەم کارەشی بۆمایەوە تاکوو ئیسلام هات وبەتەواوی لەسەر ئەم کارە جێگیری کرد .

جارۆژبەڕۆژ عەبباس وپێغەمبەرمان ﷺ گەورەتر دەبوون ،هەروەها پەیوەندییەکی ئەوەندە بەهێز لەنێوانیان دروست ببوو، لەدواییدا بەشێوەیەکی کرداری دێینە سەر باسیان .

بەڵێ لە ڕۆژە یەکەمەکانی دابەزینی نیگا بۆسەر پێغەمبەرمان ﷺ لەتەمەنی چل ساڵیدا قوڕەیش تووشی نەهاتیەکی توونددەبن ، جالەم کاتانەدا پێغەمبەرمان ﷺ دانیشتبوو بیری لەو نەهاتیە توونددە دەکردەوە ، ئەوەبوو ئەبووطالبی مامی بەیادهاتەوە کەوا پیاوێکی هەژاربوو ومالْ ومنداڵێکی زۆری هەبوو چۆن لەم نەهامەتیەدا ڕزگاری بکات ، هەروەها بینی عەبباسی مامی دەوڵەمەندە ، بیرورایەکی لە مێشکی پیرۆزی دروست بوو ، پیاوەتی وهەستی مرۆڤایەتی بانگی کرد ... ئەوەبوو یەکسەر ڕووی لەماڵی مامی(عەبباس) کرد وئەم مەسەلەیەی بۆ باس کرد وداوای لێکرد تۆزێك ئەم ناخۆشیە لەسەر باڵی مامیان هەڵبگرن .

ئەوەبوو پێغەمبەرمان ﷺ بیروڕایەکی پێشکەش کرد کەوا هەر یەکێکیان کوڕێکی ئەبووطالب بگرنە ئەستۆی خۆیان ، جا پێغەمبەرمان ﷺ ئیمامی عەلی وعەبباسیش جەعفەری گرتە ئەستۆی خۆی .

کاتێك عەبباس ئەم پیاوەتیەی پێغەمبەرمانی ﷺ بینی زۆر کەیف خۆش بوو وەسوپاسی هەستی پیرۆزی کرد.

ڕۆژێکیـان بازرگـانێکی بـەناوبانگ دێتەمەککـە بـەناوی (عفیـف الکندی) ، دەبێت بەمیوانی عەبباس وهاوڕێیەکی خۆشەویستی دەبێت ، ڕۆژێکیان عەبباس وعفیف دادەنیشن لەلای کەعبە ، عفیف دەبینـێ پیاوێك وئافرەتێك ومنداڵێك لەلایەکی کەعبە کڕنۆش وسوجدە دەبەن، یەك لـەدوای یـەك دەوەسـتن ، عــەفیف ســەری ســوڕدەمێنێ لــەم خواپەرستیەی ئەم سێ کەسـە بۆیـە ئـاوڕێك لەعـەبباس دەداتـەوەو دەڵێت :

ئەی عەبباس ئەوانە کێن ؟...

ئەویش گووتی :

ئەوە بـرازام موحەممـەدی کـوڕی عبداللهیـە ، بانگەشـەی ئـەوە دەکات خوا ڕەوانەی کردووە بە پێغەمبـەرو خشـڵی کیسـراو قەیسـەر دەکەوێتـە بەردەسـت ئـەو ، ئەمـەش خەدیجـەی خێزانیـەتی وبـڕوای پێهێناوە ، ئەم مێردمنداڵەش عەلی کوڕی ئەبووطالبەوئـەمیش بـڕوای پێهێناوە.

- سوێندبەخوا لەسەر ئەم زەوییە بێجگە لەم سێکەسە کەسیتر بەم ئایینەی نەزانیوە.

عـەفیف سەریسوڕما لەقسـەکانی عـەبباس ، پاشـان هـەردوو پیاوەکە ماوەیەك پێکەنین بەم ئایینەی کەوا ئـەم سێکەسە بڕوایـان پێهێناوەو بریتین لە پیاوێك وئافرەتێك ومنداڵێك .

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم دووپیاوە کاتێك پێکەنین نەیاندەزانی خـوای گـەورە لەغەیبـەوە چ شـتێکی بـۆ ئـەم پیاوەبنیـات نـاوەو چ پلەوپایەیەکی پێدەبەخشێ ...

عەفیف لەپاش ئەم ڕووداوە بەچەندساڵێك موسڵمان بوو، بەهیوا بوو ئەم ڕۆژە خوا بەخششی موسڵمان بوونی پێبەخشیبا کاتێك لـەبن دیواری کەعبە دانیشتبوو لەگەڵ عەبباس .

❁ ❁ ❁

پێغەمبەر ﷺ زۆر هەوڵی دەدا مامی (عەبباس ) ڕابکێشێ بـۆ نـاو ئیسلام ، چەندجاران بانگی دەکردبۆ ناو کۆمەڵەکانی ،بەڵام عـەبباس

لە هەموو جاران ڕازی نەدەبوو هەرچەندە برازاکەی خۆی زۆر خۆشدەویست .

عەبباس پێغەمبەری خوای ﷺ زۆرخۆشدەویست ، سەرچاوەی ئەم خۆشەویستیەش بریتی بوو لەهەستی بنەماڵەوهۆزایەتی وخوێن ، هەروەها درێخیشی نەدەکرد لە بەرگری کردن ولادانی ئازار لەسەری ، بەڵام لەگەڵ ئەمانەش قەدەغەی ئەوەی دەکرد بڕوا بهێنێ بە ئایینەکەی وببێت بە یەکێك لە شوێنکەوتوانی .

جا لەسەر ئەم بارە پەیوەندی لە نێوان عەبباس وپێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی بیست ساڵ یان زیاتر مایەوە لەم ڕۆژەی پێغەمبەرایەتی بۆ موحەممەد ﷺ هاتەخوارەوە، تاکوو ویستی خوا دابەزی و عەبباس لە ساڵی هەشتەمی کۆچی بڕوایی هێنا ...

یەکێك لەدیاردەکانی خۆشەویستی عەبباس بۆ برازاکەی ئەوەبوو کاتێك بێباوەڕ بوو لەگەڵیشی چووە دەرەوەبۆ بەیعەی عەقەبەی دووەم بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەسەر سەلامەتی برازاکەی ، جا عەبباس لەسەرەتای بەیعەوە ئامادەیی خۆی نیشاندا تاکوو بەیعەکە تەواوبوو ، جانیازی پێغەمبەریش ﷺ لە ئامادەبوونی مامی ئەوەبوو تاکوو بزانێت چۆن هاوڕێکانی پەیمانی جەنگ ومردنی بۆ دەدەن ...

کاتێك پێغەمبەر ﷺ و پەیماندەرەکان کۆبوونەوە ، عەبباس تەماشای کردن بۆئەوەی خۆشی لەسەر ڕووی خەڵکەکە ببینێ و پێش ئەوەی خەڵکەکە قسە بکەن ، دەستی بەقسە کردو گووتی:

ئەی کۆمەڵیخەزرەج ، بەڕاستی موحەممەد لە ئێمەیەو لە کاتێك دەزانن لە چ پلەیەکی عیززەت وڕێزدایە ، جابەڕاستی بڕیاری داوە بێتەلای ئێوە ، ئینجا ئەگەر ئێوەش وا ڕادەبینن بەسەلامەتی نایهێڵنەوە هەر لەئێستاوە وازی لێبهێنن با بەسەربەرزی وبەڕێز بمێنێتەوە .

جا کاتێك عەبباس لەقسەکانی تەواوبوو یەکێکیان گووتی :

گوێمان لێبوو چیت گوت ئەی عەبباس ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قسە بکە بۆخۆت وپەروەردکارت چی پێخۆشە بڕیار بدە .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز بۆ خوێندنەوە وزیاتر ئیسلامی‌لەلا خۆشەویست کردن وپاشان فەرمووی :

پەیمانم بدەنێ چۆن ئافرەت ومندالەکانتان دەپارێزن منیش بەمجۆرە بپارێزن ...

ئەوانیش موبایەعەیان لەگەڵ کرد .

دوای کۆتایی هاتنی بەیعەتەکە پێغەمبەر ﷺ ومامی عەبباس گەڕانەوە وپاش ئەوەی بەچاوی خۆیان بینیان چۆن موسڵمانان بەخوێن وبە گیان خۆیان فیدای پێغەمبەرەکەیان دەکەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆمەدینەو عەبباس لە مەککە مایەوە تاکوو جەنگی بەدر هات ، قورەیش خۆیان ئامادە کرد تاکوو کۆتایی بە ئیسلام وموسڵمانان بهێنن ، قورەیشیەکان سەرکردەکانی خۆیان گرت بۆ ئەوەی ببن بە پێشەنگ لە جەنگە دۆڕاوەکەیان ، عەبباس هیواخواز بوو ببێت بە یەکێك لەدواکەوتووەکانی ئەم جەنگە وجا حەزی عەبباس لە بەشداری نەکردنی لەم جەنگە لەبەر ترس ومردن نەبوو ، لەبەر ئەوەی عەبباس قارەمانێکی بێوێنەی وابوو نەیدەزانی ترسی مردن وڕووبەڕووبوونەوە مانای چیە ؟!

هەروەك هەندێك لەم داستانەی کەوا مێژووی ئیسلام بۆی تۆمار کردووە لە ئازایەتی و قارەمانیەتی دەیسەلمێنێ ...!

حەزی دەکرد دەرنەچێت لەگەڵ قورەیش بۆ ئەم جەنگە ، لەبەر ئەوەی دەیزانی جەنگ لەگەڵ برازاکەی و شوێنکەوتووەکانی دەکات ، هەروەها عەبباس زۆر دەترسا لە مەترسی قورەیش بۆ سەر برازاکەی ، بەڵام عەبباس لەم کاتەدا نەیدەتوانی ئەم ترسە لەسەر برازاکەی لاببات و لە جەنگەکە بەدواکەوێت ، جابەنابەدڵی وناچاری لەگەڵیان دەرچوو .

کاری عەبباس بەمە نەوەستا بەڵکو بووبە یەکێك لە ئەندامانی خۆراکدەرەکانی سوپای قورەیش ، ئەوەبوو سەرکردەکانی قورەیش ودەوڵەمەندەکانیان سوێندیان خوارد هەر یەکێکیان ڕۆژێکی تەواو خواردنی سوپا بدەن لە کاتێك سوپای قورەیش ژمارەی دەگەیشتە هەزار جەنگاوەر ، هەروەها ئەوانەی خواردنی سوپایان دەدا دوازدە کەس بوون ،عەبباس یەکێك بوو لەوان ، هەردوو سوپاکە بەڕێکەوتن تاکوو بەیەکگەیشتن لە بەدر ، چاوەڕێی نیشانەی یەکەمی جەنگیان

دەكرد ، پێغەمبەر ﷺ دەیزانی عەبباسی مامی بەنابەدڵی لەگەڵ قورەیش دەرچووە .

جالەم كاتانەدا پێغەمبەر ﷺ هەڵوێستەكانی مامی لەیاد نەدەچوو لە لادانی ئازارو پارێزگاری كردنی لە مەككە ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە باشی زانی بانگەواز بكات بەناو لەشكرەكەی و فەرمووی :

﴿ بەڕاستی دەزانم كەسانێك لەنەوەی هاشم وهیتر دەرچوونە بەناچاری بۆ ئەم جەنگە وجا پێویست ناكات شەڕیان لەگەڵ بكەین ، هەر یەكێك گەیشت بەمانە لەنەوەی هاشم با نەیانكوژێت ... هەركەسێك گەیشت بە ئەبولبەختەری كوڕی هیشام با نەیكوژێت ،هەركەسێك گەیشت بە حەكیمی كوڕی حوزام با نەیكوژێت ، هەر كەس گەیشت بە عەبباسی كوڕی عبدالمطلب با نەیكوژێت ، چونكە بەڕاستی بەناچاری لە گەڵیان دەرچوون ﴾.

لەم كاتانەدا پیاوێك لە موسڵمانان بە ناوی ( ئەبو حوزەیفەی كوڕی عوتبە) هاواری كرد ئایا ئەمانەباوك و منداڵ وبراو هۆزمان بكوژن و ئێمەش دەست نەدەینە عەبباس ، سوێند بەخوا ئەگەر بگات پێم بە شمشێر لەتی دەكەم .

ئەم ووشەیە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ زۆر توورە بوو و دڵی بریندار بوو ـ لەم كاتەدا عومەری كوڕی خەتتاب لە تەكی بوو ـ جا پێغەمبەر ﷺ بە عومەری فەرموو :

ئەی ئەبا حەفص ئایا لە دەمووچاوی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەی بە شمشێر ؟؟

ئیمامی عومەر گووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگام پێبدە لەملی ( ئەبوحوزەیفە) بدەم ، سوێند بەخوا ئەمە نیفاقی كردووە ، ئەبوحوزەیفە گوێی لە قسەكانی ئیمامی عومەر ﷺ بوو زۆر ترسا زۆر پەشیمان بۆوە لەم قسەیەی لە دەمی دەرچوو .

جا دەیگووت سوێند بەخوا ئەمین نیمە لە خۆم لەم قسەیەی كردم ، بەردەوام لە خۆم دەترسم ، خوای گەورە لەم گوناهەم خۆش نابێت تەنها بە شەهیدی نەبێت ـ جابەڕاستی خوا لێی خۆشبوو

بەوەی لە جەنگی یەمامە ئەبوحوزەیفە تـامی شەهادەتی چەشت ــ خوا لێی ڕازی بێت .

جا ئـەوەبوو جـەنگ دەسـتی پێکــرد و جـەنگاوەران تێکـەڵی یەکتربوون ، تۆز بەری ئاسمانی گرت ، شمشێرەکان شریقەیان گوێـی مرۆڤی کاس دەکرد ، ئەوەی کوژرا کـوژرا،ئـەوەی شـەهید بـوو ئـەوا شەهیدبوو ،جەنگەکە کۆتایی پێهات بـە سـەرکەوتنی موسـڵمانان بـە سەرکەوتنێکی یەکجار مەزن ، هەروەها موسڵمانان حەفتا کەسیان لە قورەیش بەدیل گرت .

عەبباس خوا لێی ڕازی بێت یەکێك بوو لەم دیلانە ...

بەڵێ عەبباس ﷺ لەجەنگی بەدر بە دیل گیرا ، وە ئـەو کەسـەی بەدیلی گرت پیاوێك بوو لـە ئەنصاریـەکان بـە نـاوی ( ئەبوالیسـر ) ، کەوا پیاوێکی لاوازی بێهـێزبوو بـەلاَم عـەبباس پیـاوێکی بەکەلەشـی بەهێز بوو، جارێکیان پێغەمبەری خـوا ﷺ پرسـیاری لـە (ئەبوالیسـر) کرد چۆن توانیت عەبباس بەدیل بگریت لەگەڵ بـێ هـێزی ولاوازیـت ، ئەویش گووتی :

پیاوێك لەسەری یارمەتیدام پێشتر نەمبینیبوو ــ بەفلاَن شێوە وشێوە... ــ جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو :

**﴿ لقد أعانك عليه ملكٌ كريم ﴾ .**

واتە : ﴿ بەڕاستی فریشتەیەکی بەڕێز لەسەری یارمەتی داویت ﴾.

جابـە ڕاسـتی بـەدیل گیرانی عــەبباس بەدەســتی ئەبوالیســر کارێکی سەرسوڕهێنەر بوو .

جارێکیان وا ڕویدا یـەکێك لـەکوڕەکانی عـەبباس پرسـیاری لـە باوکی کرد و گووتی :

ئەی باوکە ( ئەبوالیسر ) چۆن توانی ڕۆژی بەدر بە دیلت بگرێت ... ئەویش گووتی :

سوێند بەخوا ئەگەر حەزی بکردبا لە بن باغەڵی خۆی دەنام .

جاپێی گووت :

ئەی ڕۆڵەم ئایا تەماشـای کەلەشـی دەکـەیت یـا خـود سـەیری هەیبەتی دەکەیت ؟؟!

سوێنـد بـەخوا شـێوەی کەلەشـی لەبـەر چـاوی مــن لــە فیــل گـەورەتربوو ، ئـەم پیـاوە بچووکـە هـەر دوو قۆڵـەکانی گــرتم و بــە

شێوەیەکی وا دەستەکانی گرتم جاگومانم برد خوێن لە نینۆکەکانم فرکەی دەکات ، پاشان دەستەکانی بادام ولەپشتەوە هەردوو دەستەکانی گرتم ، ئینجا بە پەتێك لە پشتەوە دەستەکانی بەستامەوە نەمتوانی بەرگری لە خۆم بکەم ، پاشان بە پێشەخۆی دام ... ئەنصاریەکە منی برد تاکوو گەیاندمیە سەربازگەی دیلەکان و لەگەڵ ئەوانی دانام وبەستامیەوەبەپەت ...

عەبباس ﷺ لە سەربازگەی دیلەکان لەکاتی شەودا نالەو نوزە نوزەکی زۆری لێدەهات تا وای لێهات نالەو نوزەی گەیشتە گوێی پێغەمبەر ﷺ ، جا پێغەمبەر ﷺ هەڵسایەوەو خەو لە چاوی نەکەوت ، هەندێك لە یاوەرەکانی پرسیاری ئەوەیان لێکرد چونکە نیشانەی خەم وخەفەت لە نێوچەوانی پیرۆزی بەدی دەکرا ، جا گووتیان بۆچی خەوت لێ ناکەوێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ...؟؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :

نوزەی عەبباس خەوی لێ بڕیوم ...

ئەوەبوو پیاوێك چووە ناو سەربازگەکەو چووە لای عەبباس پرسیاری ئەم شتەی لێکرد ، زانی پەتەکەی دەستی زۆربەتووندی بەستراوە ، جا ئەوەبوو پیاوەکە پەتەکەی بۆ شل کردەوە ، ئینجا عەبباس بێ دەنگ بوو پیاوەکەش گەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ ، جا گوێی لێبوو فەرمووی :

بۆچی گوێم لە نالەی عەبباس نیە ؟

پیاوەکە گووتی :

من دەستەکانم شل کردۆتەوە .

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو :

ئەمە لەگەڵ هەموو دیلەکان بکە.

ئینجا ئەم ووشەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگێکە لە ڕەنگدانەوەی دادوەری کەوا دەیسەلمێنێ ئیسلام ئازار لەسەر دیل هەڵدەگرێ لە کاتێکدا دەستەوەستان دەکەونە بەردەستی موسڵمانان بە پێچەوانەی لایەنی بێباوەڕان کەوا جۆرەها ئازارو ئەشکەنجە دەخەنە سەر دیلەکانیان ...

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا کەوا دیلەکان خۆیان بکڕنەوە،جا ناردیە دوای عەبباس و پێی فەرموو :

خۆت بكڕەوە ئـەی عـەبباس لەگـەڵ دوو برازاكــەت عــەقیل و نەوفل و عوتبەی هاوپەیمانت .

عەبباس گووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بیست ئۆقیەم لەو ماڵـە بـۆ دابنـێ كەوا لەلام بوو ـ چونكە ڕۆژی جەنگەكە عەبباس بیست ئۆقیەی لـەلا بوو موسڵمانەكان بە دەسكەوت كەوتە بەر دەستیان ــ پێغەمبـەر ﷺ بە پێكەنینەوە پێی فەرموو :

نەخێر ، ئەمە شتێك بـوو لـە تـۆوە خـوا پێـی بەخشیوین ، جـا لێرەدا عەبباس لەدوای ئەمەدا گەڕا كەوا فێڵێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ ببینێتەوە بۆ ئەوەی خۆی پێ ڕزگار بكات لە گەڵ ئەوانەی لە گەڵی دابوون بە بێ ئەوەی هیچ ماڵێك بدەن ، جا گووتی هیچ ماڵم نیە .

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەی بردەوەو پێی فەرموو :

ـ ئەی كوانێ ئەم ماڵەی لەلای ( أم الفضـل )ت دانـابوو ــ واتـە خێزانەكەت ــ وەپێت گووت ئەمە بەشی فەضل وئەمە بەشی عبدالله و ئەمە بەشی عبیدالله .

جا ئەم ووشــەیەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕووداوێكـی گـەورە بـوو دەروونی عەبباسی هەژاندەوە ، كەوا چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بەمەی زانی لە كاتێكدا ئەم شتەبێجگە لە خۆی و لە ژنەكەی كەسی تـر پێـی نەزانیوە كەوا پێش جەنگی بەدر گووترا بوون .

كاتێك عەبباس زانی ژنەكەی نهێنیەكەی دركـاندووە ، هـەروەها فێڵەكەی بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ سەری نەگرت ئەوەبوو گووتی :

من دەزانم تۆ ڕاست دەكەیت ، بەڕاستی ئەم شتە بێجگەلە من و ( أم الفضل) كەس بەم كارەی نەزانیووە ، پاشان ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێكرد بۆی هێنان ...

عـەبباس ﷺ گەڕایـەوە مەككـە ، پاشـان بینـی وا جـارێكی تــر قوڕەیش خۆیان ئامادە دەكەن بۆ ئەوەی بەسەر پێغەمبەری خـوا ﷺ دابدەن و تۆڵەی ئەم شكستیە بكەنـەوە كـەوا بەسـەریان هـاتبوو لـە جەنگی بەدر ، ئەوەبوو داوایان لە عەبباس كرد جارێكی تر لە گەڵیان دەربچێت بۆ جەنگی ئوحود ویارمــەتیان بـدات بـە مـاڵ هـەروەكو لـە جەنگی بەدر كردی ، بەڵام عەبباس پاساوی بۆ هێنانــەوەو بەشـداری لەگەڵ نەكـردن .

لەبەر ئەوەی سەرکەوتنی موسڵمانان لـە جـەنگی بـەدر کـارێکی گـەورەی لـــە دەروونـــی عـــەبباس کردبـــوو ، زۆر دڵخـــۆش بـــوو بـــە سەرکەوتنی برازاکەی ، کاتێك بینی قورەیش خۆیان ئامادە دەکەن بۆ سـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆژی ئوحـود هـەوڵی دا چاکـەی ئـەو هەڵسوکەوتەجوانەی پێغەمبـەر ﷺ بداتـەوە کـەوا لـە جـەنگی بـەدر بەرامبـەری کردبوویـان ، بۆیـە بـە هەسـتێکی نەتەوەگـەری هەڵسـا نامەیەکی بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد و هەواڵی خۆ ئامادە کردنی قورەیشی پێدا لە گەڵ ژمارەو هێزیان ، نامەکەی دا دەست پیاوێك لـە غـەفار و فەرمانی پێکرد بیبات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە .

غەفاریەکە گەیشتە مەدینە و نامەکەی دادەست پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ نامەکەی دابە ( ئوبەی کـوڕی کـەعب ) ئـەویش بۆی خوێندەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك لە پیاوەکانی خۆی نـاردە دەرەوەی مەدینە بۆ ئەوەی هەواڵی قورەیشی بۆ بـهێنن ، ئـەوەبوو ئـەوەندەی نەبرد بینیان وولاخەکانی قورەیش دەیانەوێت لەمەدینە نزیك ببنەوە؛ جابەپەلە گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەم هەواڵەیان پێدا .

جابەپەلـەو بـە هـێزەوە پێغەمبـەری خـــوا ﷺ یاوەرەکـــانی کۆکردەوەو سوپای ئامادە کرد .

ئەوەبوو دەرچوون بۆ گەیشتن بە قورەیـش ، ئەگـەر نامەکـەی عەبباس نەبوایە ئـەوا لـەپڕێکا قورەیش پـەلاماریان دەهێنایـە سـەر موسڵمانان پێش ئەوەی سوپا ڕێك بخەن و ڕیزەکانیان دروست بکـەن ، جا ئەم نامەی عەبباس شتێك بوو تاکوو ژیانیـان مـابوو لـە یادیـان نەدەچۆوە .

❁ ❁ ❁

چەند ڕۆژگارێکی پێچوو ، لە ساڵی هەشتەمی کۆچی پێغەمبـەر ﷺ بڕیـاری فـەتحی مەککـەی دا ، ئـەوەبوو خۆیـان ئامـادە کـرد و سوپایەکی گەورەی دەهەزار کەسـیان ڕێکخسـت ، پاشـان بـە نـهێنی وبێدەنگی دەرچوون بە نیازی مەککە .

عەبباسی کوڕی عبدالمطلب ﷺ پێش دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ ، لە مەککە لەگەڵ خێزانەکەی ( أم الفضل ) دانیشتبوو ئەم قسەیەی برازاکەی موحەممەدی بەیاد هاتەوە ، ئەوەبوو عەبباس باسی برازاکەی دەکرد سەبارەت بەجوانی ڕەوشت و مەزنی دەستپاکی وچاکی هەڵسوکەوتی ، هەروەها چیرۆکی ئەو ماڵەی کە لەلای خێزانەکەی داینابوو پێش دەرچوونی بۆ بەدر ، جا حەزی خوا وابوو عەبباس هیدایەت بدرێ و سینگی جۆش بدرێ بۆ ئیسلام ، هەروەها ئەو کۆسپانەی بکرێنەوە کە ببوونە هۆی ئەوەی دڵی ڕەق ببێ ، جا لەگەڵ خێزانەکەی ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کۆچ بکەن بۆ مەدینە و بگەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی بڕوای پێ بهێنن ، بۆ بەیانی عەبباس و خێزانەکەی بە نیازی مەککە بەڕێکەوتن . جا قەزاو قەدەری خوا وابوو عەبباس لە شوێنێك بگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەڵێن ( الجحفة) کەوا چوار فەرسەخ لە مەککە دوورە ، پێغەمبەر ﷺ سەری سوڕما بە گەیشتنی بە عەبباس و پرسیاری ئەوەی لێکرد ، ئەویش گووتی کەوا هاتووە بڕوا بە خوا بهێنێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر زۆر کەیف خۆش بوو بە موسڵمان بوونی مامی و نیشانەی کەیف خۆشی لەسەر نێو چەوانی بە دیار کەوت و تەماشای کرد بە هەموو مانایەکی ڕازی بوون و دڵنیایی و ووشەیەکی نەمری پێ فەرموو ، وەلە خۆشیان فرمێسك لە چاوە پیرۆزەکانی هاتە خوارەوە :

**﴿ هجرتك يا عم آخر هجرة كما أن نبوتي آخر نبوة ﴾ .**

واتە: ﴿ کۆچکردنەکەی تۆ ئەی مامە کۆتا کۆچکردن بوو هەروەك پێغەمبەرا یەتی من کۆتا پێغەمبەرایەتی بوو ﴾.

عەبباس زۆر دڵخۆش بوو بەم ووشەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، پاشان کەسوکاری ڕەوانەی مەدینە کرد بۆئەوەی یەکسەر بگات بە سوپای پێغەمبەری خوا ﷺ وببێت بە موجاهیدێك لە موجاهیدەکان ، بەمجۆرە سوپا لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو تاکوو گەیشتە (مُرالظهران) ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد سوپاکە پشوو بدات ، هەروەها دەهەزار ئاگر بکەنەوە .

جا عەبباس لە نیازی موسڵمانان گەیشت ، هــەروەها زەبـەلاحی ئەم سوپایەی بینی کەوا هـێزی موسـڵمانان بـە ئـەندازەی سـەدهەزار جـەنگاوەرە بەرامبـەر بەسـوپای قورەیش ، ئـەوەبوو تـرس کەوتـــە ناودڵی لەبەر خەڵکی مەککە ، چونکە لەوە ترسا ئەم سـوپایە بڕژێتـە نـاو شـاری مەککـەو خەڵکەکـە لەگـەڵ زەوی بکاتـە یـــەك ، هــەرچی عەبباس بوو پیاوێکی بەبەزەیی ودڵنەرم بوو ، زوو سۆزی هەڵدەستا، لەبەر ئەوە حەزی کرد پێغەمبــەر ﷺ بچێتـە نـاو مەککـە بـەبێ شـەڕو کوشتارو مەککەش هەر بە سەرفرازی و سەربڵندی بمێنێتەوە ، بـەلاّم ئایا ئەوە چۆن دەبێت ؟؟

جا عەبباس ئەوەی بەباش زانی کەوا ئەم شتەی بە مێشك دادێ لەلای پێغەمبەر ﷺ باس بکات ، چونکە وای لە پێغەمبەر ﷺ دەڕوانـی خۆزگەی ئەوە دەخوازێ کەوا بچێتە ناو مەککە بەبێ جەنگ ، چونکە پێغەمبەر ﷺ پێویستی بەشەڕ نیە لە کاتێکدا بە بـێ شـەڕ بگـات بـەو ئامانجەی کە دەیەوێت .

ئەوەبوو سەرەتای پیلانەکەی عەبباس سواری وولاّخە سپیەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئینجا لە سەربازگە دەرچوو بۆ سەر ڕێگای گشتی .

عەبباس لە دڵی خۆیدا دەیگووت :

خۆزگە ڕێبوارێك یاخود مەڕدارێك لە خەڵکی مەککەم دەگەیشتێ وئەم هەواڵەم پێدا ڕەوانە دەکردەوە کەوا نیازی پێغەمبــەری خـوا ﷺ چیە لەم دەرچوونە ، جابە ئاسانی ڕێگای بدەن پێش ئەوەی هێزیـان لە دژی بە کار بهێنێت .

جائەوە بوو لـە کۆتـاییدا قورەیـش زانیـان پێغەمبــەری خـوا ﷺ خۆی ئامادە کردووە بۆجەنگ لەگەڵیان ، بەلاّم زۆر دڵنیا نەبوون لەم هەواڵە ، جائەبوسـوفیانی کـوڕی حـەڕب و حـەکیمی کـوڕی حـوزام و بەدیلی کوڕی وەرقاء چوونە دەرەوە بو ئەوەی لەم کارە بکۆڵنــەوەو بزانن تا چ ڕاددەیەك ڕاستە یا خود درۆیە ، هەرسێکیان چوونـە سـەر چیایـەکی مەککـە ، جالـــە دوورەوە ئـــاگرێکی زۆریـــان بینـــی کـــەوا سوپایەکی گەورەشی لەگەڵە ، ئەبوسوفیان سەری سوڕما و ئاوڕی لە بەدیل دایەوەو گووتی :

هیچ شەوێك وەکو ئەم شەوە ئاگرو سەربازگەی وام نەدیوە ...

ئینجا بەدیل گووتی :

ئەوە سوێند بەخوا خوزاعەیەو شەڕ گەرمی کردوون .

ئەبوسوفیان گووتی :

خوزاعە ئەوەندە زۆرنیە کەوا ئەم ئاگرو سەربازگەیەیان هەبێت ، لەم ساتانەدا عەبباس لەڕێگابوو ، جاگوێی لە خەڵکێك بوو گفتوگۆیان دەکرد ، ئەوەبوو تەماشای شوێنی دەنگەکەی کرد وئەوانی بینی ، جابە هەموو مانایەکی سەرسوڕمان سەری‌سوڕماو بە دەنگە گەورە پیاوانیەکەی گووتی:

ـ أبا حنظلة .

ئەبوسوفیان هەر کەگوێی لەم دەنگە بوو هەموو گیانی بووە ترس ، ئاوڕی لە پشتەوەی خۆی دایەوەو جا عەبباسی بینی ، بەسەرسوڕمانیەوە بانگی کرد :

ـ أبا الفضل .

ئەویش گووتی:

بەڵێ ... هاچیتە ئەی ئەبا سوفیان .

ئینجا عەبباس گووتی :

سوێند بەخوا ئەمە پێغەمبەری خوایە ﷺ خەڵکێکی لەگەڵە هاتووە بۆسەر ئێوە شتی واتان هەرگیز بەسەر نەهاتووە .

جا ئەبوسوفیان هاواری کرد :

هاوار بۆئێوە ئەی قوڕەیش ، جاچار چیە دایك وباوکم بە قوربانت بێت .

عەبباس گووتی:

سوێند بەخوا ئەگەر پێت بگات لە ملت دەدات ، جا لەپشتەوەی من سواری ئەم وولاخە ببە تاکوو بتبەم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وبە هۆی منەوە پەنات بدات .

ئەوەبوو ئەبوسوفیان بەپەلە لە پشتەوەی عەبباس سواری وولاخەکەبوو ، دڵە کوتەی گرتبوو، لەترسان هەموو گیانی دەلەرزی .

عەبباس ڕۆیشت تاکوو گەیشتە سەربازگە ، بەلای هەر ئاگردانێك دا دەڕۆیشتن دەیانگووت ئەمانە کێن ؟؟

جا وەڵامیان دەدایەوەو دەیانگووت ئەمە مامی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەسەر وولاخەکەی .

عەبباس بەلای ئیمامی عومەر ﷺ دا ڕۆیشت کەوا سەرۆکی پاسەوانەکان بوو ، گووتی:

ئەوە کێیە؟؟

پاشان هەڵسایەوە بزانێت ئەوەکێیە دێت بۆلایان، عەبباسی بینی وئەبوسوفیانیش لە دواوەی ، ئیمامی عومەر بازێکی هاویشت بۆلایان و گووتی :

ئەبوسوفیان دوژمنی خودا ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەوا ئەمە گەیشتە لامان بەبێ بەڵێن وپەیمان ، عەبباس بە وولاخەکەی هەلات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ عومەریش بەپەلە خۆی گەیاندە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وداوای لێکرد ڕێگای بدات ئەبوسوفیان بکوژێت ، عومەر پێش عەبباس بەچەند ساتێك گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وگووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئەبوسوفیانە خوا خستویەتە بەر دەستمان بەبێ بەڵێن وپەیمان ، ڕێگام بدە لە ملی بدەم .

هەر کە ئیمامی عومەر لە قسەکانی بۆوە عەبباس هاواری کرد و گووتی:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاستی من پەنام داوە .

جارێکی تر ئیمامی عومەر هاواری کرد وگوتی:

ڕێگام بدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەملی بدەم ، لەم کاتەدا عەبباس گووتی :

لەسەرەخۆ ئەی عومەر ، سوێند بەخوا ئەگەر پیاوانێك بوایە لەنەوەی عدی کوڕی کەعب قسەی وات نەدەکرد .

عومەر وەڵامی دایەوەو گووتی:

لەسەرەخۆبە ئەی عەبباس ، سوێند بەخوا موسڵمان بوونت لەو ڕۆژەی موسڵمان بوویت لەلای من خۆشەویستترە لە موسڵمان بوونی خطاب ئەگەر موسڵمان بوایە .

پێغەمبەر ﷺ کە بینی وا ناکۆکی تەواو دەبێت لە نێوان ئەم دوو پیاوە ، ڕووی لە عەبباس کرد وفەرمووی :

بڕۆ ئەی عەبباس ، کاتێك بەیانیت کردەوە بیهێنەوە لام .

لەم ساتەدا بانگی بەیانیدا ، خەڵك بەتاودەهاتن بۆ نوێژ ، دووبارە ئەبوسوفیان ترسا و ڕووی لەعەبباس کرد وگووتی :

ئـــەی أبـــاالفضل ئـــەم خەڵكـــە چیانـــە، ئایافـــەرمانیان پێكراوەبەشتێك؟

عەبباس پێكەنی وگووتی :

نەخێر ... بەڵكو هەڵساون بۆ نوێژ .

ئەبوسوفیان بینی خەڵكەكـە سوجدەو كڕنووش دەبەن كـاتێك پێغەمبەر ﷺ دەیكات ، ئاوڕی لە عەبباس دایەوەو گووتی :

ئەی عەبباس موحەممەد ﷺ ئەگەر فەرمانیان پیَ بكات بە شتێك ئایا دەیكەن ، عەبباس گووتی :

ئەگەر فەرمانیان پیَبكات خواردن وخواردنەوە نەخۆن گوێڕایەڵی دەكەن .

ئەبوسوفیان بەدەنگێكی هێمن ولەسەرخۆ گووتی :

هیچ پادشایەكم نـەبینیوە وەكـو ئـەوە، نـە پادشـای كیسـراونە پادشای قەیسەرو نە پادشای (بنی الاصفر) ، پاشان كەمێك بیَ دەنگ بوو وگووتی :

( ئـەی أبـاالفضل ووشـەیەك لەنەتەوەكـەت ، ئایـا لێبـوردن لەلایان هەیە)؟

پاش كەمێك عەبباس دەستی ئەبوسوفیانیگرت و ڕۆیشت بۆلای پێغەمبـەری خـوا ﷺ ، ئەبوسـوفیان بەرامبـەر پێغەمبـەر ﷺ وەسـتا ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمـوو :

خاكت بەسەریەس نیەئەی ئەبوسوفیان ،ئایا دڵت نـەرم نـەبووە تابزانیت هیچ خوایەك نیە تەنها ﴿ اللّٰه﴾ نەبێت .

ئەویش گووتی :

دایك وباوكم بە قوربانت بن، چەندە نەرم وبەڕێزو بەزەییت ، بـە ڕاستی گومانم وایـە ئەگـەر خوایـەك هەبوایـە بێجگـە لـە ﴿اللّٰه﴾ هیـچ شتێكم بە كەڵك نەدەهات .

جا پێغەمبـەر ﷺ پێی فەرموو:

خاكت بەسەر ئەی ئەبوسوفیان ، ئایا دڵت نـەرم نـەبووە بزانـی من پێغەمبەری خوام ؟

ئەویش گووتی :

باوك ودایكم بە قوربـانت بێـت ، هـەرچی ئەوەیـە لەدەروونـە ، تاكوو ئێستا شتێكم لە دڵدایە .

لەم کاتەدا عەبباس ئاوڕی لێدایەوەو گووتی :

خاکت بەسەر موسڵمان ببەو شاهێدی بدە هیچ خوایەك نیە کەشایەنی پەرستن بێت بێجگەلە ﴿الله﴾ وموحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە پێش ئەوەی لەملت بدەن ، ئەبوسوفیان موسڵمان بوو پاشان ئاوڕی لە پێغەمبەر ﷺ دایەوەو گووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بینیت قورەیش دەستیان هەڵگرت ئایا سەلامەت دەبن ؟؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :

بەڵێ ... هەرکەسێك دەستی دا ودەرگای لەسەرخۆی داخست سەلامەتە .

عەبباس زۆر شارەزا بوو لەڕەوشتی ئەبوسوفیان بۆیە ڕووی لە پێغەمبەر ﷺ کرد و گووتی:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوسوفیان پیاوێکەحەز بەشانازی دەکات جا شتێکی بۆبکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەبەستی عەبباس گەیشت و فەرمووی :

بەڵێ ، هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان سەلامەتەو هەر کەسێك بچێتە مزگەوت (واتە کەعبە) سەلامەتە و هەر کەسێك دەرگای لەسەرەخۆ داخست سەلامەتە ...

پێغەمبەر ﷺ بەسەرکەوتوویی و بەبێ‌جەنگ چووە ناو مەککە ولە گەڵ مامی عەبباس بتەکانیان دەشکاند، جارجارە پێغەمبەر ﷺ ئاوڕی لە عەبباس دەدایەوەو دەیفەرموو:

**هیة یاأبتی** ، عەبباسیش تەماشای‌دەکرد ودەیگووت:

**هیة یابنیّ .**

پاش تەواو بوونی شکاندنی بتەکان موسڵمانان دەورەیان دابوو، ئەویش بەزەردەخەنەوە دەیفەرموو :

**﴿ من رآنی والعباس فکأنما رآأبوینا ابراهیم و اسماعیل اذ یرفعان القواعد من البیت ...﴾ .**

واتە: هەر کەسێك من وعەبباس ببینێت هەروەکو ئەوەیە باوکانمان ئیبراهیم و ئیسماعیلیان بینی‌بێت کاتێك کۆڵەگەکانی بەیتیان بڵند دەکرد .

❁ ❁ ❁

جا ئەی برایانی موسڵمان لێرەدا ئازایەتی عەبباسمان بۆبە جوانی بەدیار دەکەوێت ، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەشەڕی حونەین نموونەی شاخێکی پتەو وەستاو ئارامی گرت کاتێك هەوازن سی هەزار جەنگاوەریان ڕەوانەیسەریان کرد ئەوانیش دوازدەهەزار کەس بوون.

ئەوەبوو لەسەرەتای جەنگەکە هەوازن پەلاماری یەك لەدوای یەکیان دەهێنایە سەر موسڵمانان ، هەندێك لە تازە موسڵمانەکان پشتیان هەڵکرد و هەڵاتن ، موسڵمانەکانیتریش بەدوایان داچوون ، چەند ساتێکی نەبرد پێغەمبەری خوا ﷺ کەس لەدەوری نەمابێجگە لەچەند کەسێك نەبێت کەوا بە پەنجەی دەست دەژمێردران ، ئەوەبوو سواری وولاخەکەی بوو کەوتە دوای هەڵاتووەکان و فەرمووی :
**( أنا النبي لا كذب ... أنا ابن عبد المطلب ).**

بەڵام دەنگی لەگەڵ با ڕۆیشت ، بۆیەجارێکی تر بانگی کردنەوە:
من پێغەمبەری خوام ، من موحەممەدی کوڕی عبداللەم ، من بەندەی خوا و پێغەمبەریمە ، وەرنەوە بۆلام ئەی خەڵکینە ، بەڵام کەس گوێی لەدەنگی نەدەبوو .
پێغەمبەر ﷺ ئاوڕی لە تەنیشتە خۆی دایەوە بینی عەبباسیمامی وەکو شاخ چەقیوەوبەشمشێرەکەی بەرگری لە پێغەمبەر ﷺ دەکات ، ئەوەی بەیاد هاتەوە کەوا عەبباس لە هەموو عەرەبان دەنگی بەهێزترە ، بانگی کرد ئەویش بەخێرایی بۆلای هات ئینجا پێیفەرموو :
ئەی عەبباس ، بانگی ئەو موهاجیرانە بکەکەوا پەیمانیان لەژێر دارەکەدا و ئەو ئەنصاریانەی کەوا بوونە هۆی یارمەتی وسەرکەوتن .
عەبباس بەدەنگە بەهێزەکەی بانگی کردن ولەدڵ ودەشتایی دەنگی دایەوە ، دەیگووت :
( يا معشر المهاجرين الذين بايعوا تحت الشجرة ، يامعشر الأنصار الذين آووا ونصروا ) .

ئەوەبوو موسڵمانەکان گوێیان لە دەنگی عەبباس بوو ، پەیمانیان بەیاد هاتەوە بە خێرایی وبەپەلە گەڕانەوە لای و جارێکیتر دەورەیان لە پێغەمبەر ﷺ دایەوە ، کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەوانی بینی زۆر دڵخۆش بوو ، بۆ ئەوەی زیاتر بەهێزیان بکات فەرمووی :

**﴿ ألآن حمي الوطيس ﴾** .

واتە : ئێستا جەنگ گەرم بوو .

ئەمجارەیان موسڵمانان کارێکی وایان بە هەوازن کرد کە بەخراپترین شکان شکستیان خوارد ، موسڵمانەکان تێیدا سەرکەوتن بە سەرکەوتنێکی یەکجار مەزن .

لە ڕۆژی تەبوك لە کاتێکدا ڕۆژێکی نەهات بوو ، عەبباس ﷺماڵێکی یەکجار زۆری بەخشی کەوا لە ژمار نایەت .

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ بینی عەبباس جلوبەرگێکی کەزیداری لەبەرە لەکاتێکدا دەم وچاوێکی سپی وجوانیشی هەبوو ، کاتێك پێغەمبەر ﷺ بینی زەردەخەنەی بردەوە ، عەبباس بە سەرسوڕمانیەوە تەماشای کرد و گووتی :

دایك وباوکم بەقوربانت بێت ، بەچ زەردەخەنەی دەبەیتەوە خوا بە زەردەخەنەت بێنێ .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

**﴿ أعجبني جمالك يا عمّ ﴾**.

واتە: ئەی مامە جوانیەکەت سەری سوڕماندووم .

لێرەدا عەبباس بیرێکی بە مێشك داهات وپرسیاری لەپێغەمبەرﷺ کرد وگووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جوانی پیاو لە چیدایە ؟؟

یەکسەر پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوەو فەرمووی :

**﴿ اللسان ﴾**. واتە: زمان .

لێرەدا عەبباس ئەم ڕێکەوتنەی هەڵقۆستەوە بۆ ئەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ فێربێت بۆیە پێی گووت :

ـ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکم فێر بکە بۆ ئەوەی پێی بپاڕێمەوەو داوای پێبکەم .

پێی فەرموو:

**﴿ سل الله العافية ... ﴾** .

واتە:داوای لەش ساغی لە خودا بکە .

عەبباس ڕۆیشت وپاشان چەند ڕۆژگارێکی بەسەرداچوو جارێکی تریش عەبباس هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی دەڵێت:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکم فێر بکە پێی بپاڕێمەوە:

جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبباسی فەرموو:

**﴿ يا عم رسول الله ﷺ سل الله العافية في الدنيا و في الآخرة ﴾...**

واتە: ئەی عەبباس مامی پێغەمبەری خوا ﷺ ، داوای خۆشی و لەش ساغی بکە لەدونیا و ڕزگاربوون لە ئاخیرەت .

یەکێك لە ئەدەبە بەرزەکانی عەبباس ئەوەیە جارێکیان پرسیاریان لێی کرد تۆ گەورەتریت یان پێغەمبەری خوا ﷺ ؟؟

ئەویش بەئەدەبێکی بەرزەوە گووتی :

پێغەمبەری خوا ﷺ لەمن گەورەترە بەڵام من دوو ساڵ بەتەمەن لەئەو گەورەترم .

۞ ۞ ۞

لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەر ﷺ نەهاتیەکی گەورە ڕووی لە وولات کرد ، برسیەتی ڕووی لە هەموو شوێنێك کرد ، ئیمامی عومەر فەرمانی کرد بەخەڵك بچنە دەرەوە نوێژەبارانە بکەن ، ئەوەبوو ئیمامی عومەر چەند جاران ئەم کارەی دووبارە کردەوە بەڵام باران نەباری ...

ئەوەبوو پاش تۆمانگ لە برسیەتی ئیمامی عومەر عەبباسی بەیاد هاتەوە ـ ئەو کاتە پیاوێکی بەتەمەن بوو ـ بە هاوەڵەکانی خۆی گووت :

بەیانی بە یەکێك باران دەبارێنم کەوا خوا بۆی دەبارێنێ .

بۆ بەیانی چووە لای عەبباس وپێی گووت :

بڕۆ دەرەوە تاکوو خوا باران بەهۆی تۆوە دەبارێنێ ...

عەبباس ڕازی بوو ، پاشان ناردیە دوای نەوەی هاشم خۆیان پاك بکەنەوە و جوانترین جلوبەرگ لەبەر بکەن ، ئەوەبوو هەموو خۆیان پاك کردەوەو خۆیان بۆن خۆش کرد پاشان دەرچوون ، عەلی

کوڕیئەبوطالب لەپێشەوەو حەسەن لەڕاستیەوەو حوسەین لە چەپیەوە ، ئەوەی هاشم لەدواوەی ، جابەئیمامی عەلی گووت:
نەهێڵیت کەس تێکەڵاو بێت لەگەڵمان ،پاشان دەستی بە نوێژە بارانە کرد و ئیمامی عومەر لەسەر چۆك بەرامبەری دانیشتبوو ، پاش ئەوەی تکاونزایەکی زۆری کرد ... پاشان ئیمامی عومەر دەستی عەبباسی گرت ولە کاتێکدا فرمێسك بە ڕیشی عەبباسدا دەهاتە خوارەوە ئیمامی عومەر فەرمووی :
( اللهم انا كنانتوسل اليك بنبينا ﷺ فسقيتنا وانا نتوسل اليك بعم نبينا فاسقنا ، قال فَيُسقَون ) . رواه البخاري
پاش ئەوەی ئیمامی عومەر لەدوعاکانی تەواو بوو عەبباس دەنگی خۆی بەرزکردەوە ، چاوەکانی وەکو کانیاو فرمێسکی لێدەهاتەخوارەوە بەسەر ڕیشی وسینگی ،ئینجا ئەویش دەستی کرد بە دوعاکردن وفەرمووی :
( اللهم انه لم تنزل بلاء الا بذنب ولم يكشف الا بتوبة وقد أتوجه القوم بي اليك لمكاني من نبيك ، وهذه ايدينا اليك بالذنوب ، ونواصينا اليك بالتوبة

هەر کە عەبباسیش لەدوعایان بۆوە تاکو هەوری ڕەشیان لە ئاسمان بینی ، ئەوەی بینیان بینیان ، چەند ساتێکی نەبرد باران ڕووی لە زەوی کرد و خەڵك ئاویان خواردەوە ، خەڵك دەورەیان لە عەبباس دا وپێیان دەگووت :
هنيئاً لك ساقي الحرمين ...
واتە: پیرۆزباییت لێ دەکەین ئەی ئاودێری دوو مزگەوتان .
جارێکیان وا ڕوویدا پێغەمبەر ﷺ عومەری کوڕی خەطابی ﷺ نارد بۆ کۆکردنەوەی صەدەقە لە موسڵمانان ، وا ڕێکەوت یەکەم جار تووشی بە تووشی عەبباس هات ، ئیمامی عومەر پێیگووت :
ئەی باوکی فەضل ، دەی صەدەقەی ماڵت دەربکە .
جالەم گفتوگۆیەدا مشتومڕێك لە نێوان عەبباس و ئیمامی عومەر ﷺ ڕوویدا ... ئیمامی عومەر چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای لە عەبباس ﷺ کرد وپێی گووت :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ منت ناردووە بۆ کۆکردنەوەی صەدەقە ، یەکەم جار گەیشتم بەمامت ،پاشان مشتومڕەکەی بۆ گێڕایەوە .

ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بە ئیمامی عومەری فەرموو:

**﴿ یا عمر أکرمه أکرمك الله ، أما علمت أنّ عم الرجل صنو أبیه ، لاتکلم العباس انا کنا احتجنا فاستلفنا صدقة عامین ...﴾ .**

واتە:﴿ ئەی عومەر ڕێزی لێبنێ خوا ڕێزت لێبنێ ، نەتزانیوە مامی کەسێك وەکو باوکیەتی ، قسە لەگەڵ عەبباس مەکە ، ئێمە پێویستیمان هەبوو صەدەقەی دوو ساڵمان لێی وەرگرت ﴾.

عەبباس ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ ئەویش پێغەمبەری خوای ﷺ زۆر خۆش دەویست ، ئەم خۆشەویستیەش کاتێك گەیشتە لوتکەی کاتێك عەبباس گوێی لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشە ، ئەوەبوو لەلای مایەوە لە سەرەتای نەخۆشیەکەی تاکوو بە خاك سپاردرا .

جارێکیان عەلی کوڕی ئەبوطالب بەیانیەك دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێك نەخۆش دەبێت ، دەبینێت بەرەو چاك بوونەوە دەچێت ، عەلی زۆر دڵخۆش دەبێ وبەغاردان دەچێتە لای موسڵمانان ومزگێنیان دەداتێ ، بەڵام ئەو نەیدەزانی ئەم چاك بوونەوەی ئەو چالاکیەکە بۆ هەڵسانەوەی پێش مەرگ ، هەندێك لە موسڵمانان پرسیاریان لێکرد وگووتیان :

ئەی باوکی حەسەن پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە ؟؟

ئەویش گووتی : بە یارمەتی خوا چاك بۆتەوە .

بەڵام هەرچی عەبباس بوو لە ئیمامی عەلی دووربین تر بوو ، ڕاست بۆوەو گووتی :

سوێند بەخوا من وا تێیرادەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەڵسانەوەی مەرگ ڕاستی کردۆتەوە چونکە من دەم وچاوی نەوەی عبدالمطلب لە کاتی مردن دەناسم ، با بەیەکەوە بچینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بزانین لەدوای خۆی دەسەڵات بۆ کێیە وئەگەر بۆ ئێمەیە بابزانین وئەگەر بۆ غەیری ئێمەش بێت ئەوا دەزانین و وەسیەتمان دەکات .

بەڵام هەرچی ئیمامی عەلی بوو ڕازی نەبوو وەگووتی:

ئێمە سوێند بەخوا ئەگەر پرسیاری ئەوە بکەین لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوا قەدەغەمان دەکاو خەڵکیش لەدوای ئەم پێمان نادەن ، جابە ڕاستی من پرسیاری ئەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەم .

ئەو گومانەی عەبباس بردی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاست دەرچوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ بارگەی گواستەوە بۆ لای پەروەردگاری و عەبباس دەست وبازووی خۆی لێ هەڵکرد بۆ ئەوەی هەڵسێت بەوەی پێغەمبەر ﷺ بەخاك بسپێرێت ، بە خودی خۆی شوشتی پاشان لە سێ بەرگی سپی لەلۆکەکفنی کرد ، عەبباس خۆی لە گۆڕەکە چووە خوارەوەو ، هەروەها دوو کوڕەکەی ( الفضل وقثم )ی لەگەڵ بوو بۆ ئەوەی بۆ جاری کۆتایی پێغەمبەری خوا ﷺ ببینن .

جا عەبباس زۆر خەمناك بوو بۆ پێغەمبەریخوا ﷺ بەڵام پێشوازی لە قەزای خودا کرد و بەدڵ و دەروونێکی بەهێزەوە ئارامی گرت .

عەبباس بە درێژا یی دوو ساڵی تەمەنی خەلیفایەتی ئەبوبەکری صدیق ﷺ موجاهید بوو لە ڕێگای خودا .

عەبباس ﷺ لە تەمەنی هەشتاوهەشت ساڵی لە ساڵی سیودووی کۆچی لە مانگی ڕەجەب ڕۆژی هەینی گیانی پاکی بە پەروەردگار سپارد ، ڕۆژی کۆچی دوایی عەبباس هەر هەموو خەڵکی مەککەو مەدینە لە دەوری لاشە پیرۆزەکەی کۆمەڵەیان کردبوو ، ئیمامی عوسمان ئەمیری بڕواداران ﷺ بە دەستی خۆی شوشتی و لە بەقیع بە خاك سپاردرا لە گۆڕستانی نەوەی هاشم .

**بەم جۆرە ئیمامی عەبباس ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ بەمەردی ژیاو بەمەردی کۆچی دوا یی کرد ، ڕەزای خوا لە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت .**

# ﴿١٠٢﴾
# ثومامەی کوڕی ئوثال
## ئەوکەسەی گەمارۆی ئابوری خستەسەرقورەیش

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی شەشەمی کۆچی بڕیاری دا سنووری بانگهێژی بۆ خودا فرەوان بکات ، جا هەشت نامەی بۆ پادشاکانی عەرەب وعەجەم نارد وتیایدا بانگی کردن بۆ یەکتاپەرستی وهاتنە ناو ئیسلام.

یەکێك لەوانەی نامەی بۆ نووسرا (ثومامە ی کوڕی ئوثالی حەنەفی ) بوو ، ثومامە یە کێك بوولە سەرۆکەکانی عەرەب لە کاتی جاهیلی و یەکێك بوو لە گەورە پیاوە ناودارەکانی ( بنی حنیفە ) ، وە یەکێك بوو لە پادشاکانی یەمامە کەوا کەس نەیدەتوانی بێ فەرمانی بکات.

ثومامە نامەی پێغەمبەری خوای ﷺ بە دەست گەیشت بەلاّم بە نابەدڵی وڕووگرژیەوە فیزی گوناهباری گوێیەکانی کەڕ کرد لە گوێدان لە بانگی حەق وخێر ، پاشان شەیتانەکانی سواری سەر ملی بوون وهانیان دا بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ وکپ کردنەوەی بانگەکەی، جا لە هەلێك دەگەڕا بۆ ئەوەی کۆتایی بە ژیانی پێغەمبەر ﷺ بێنێت ، تاکو هەلێکی بۆ ڕێکەوت ، نزیك بوو ئەم تاوانە شەیتانیە جێ بە جێ بکات، ئەگەر لە بەر یەکێك لە مامەکانی ثومامەلە کۆتا سات نەبوایە کەوا پەشیمانی کردەوە ، جا خوای گەورەش پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕزگار کرد لە خراپەی ئەم پیاوە .

بەلاّم ثومامە هەرچەندە دەستی هەڵگرت لە ئازاردانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاّم دەستیهەڵنەگرت لە ئازاردانی یاوەرەکانی ، بۆیە لە هەلێك دەگەڕا بۆ ئەوەی خراپەیەکیان پێ بگەیەنێت ، تاکودەستی گەیشتە ژمارەیەکیان بە خراپترین کوشتن کوشتنیانی ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی ئەم پیاوەی حەلاڵ کردوئەمەشی لەناو هاوەڵەکانی بلاّو کردەوە .

ساتێکی زۆری نەبرد لەسەر ئەمە ثومامەی کوڕی ئوثـال بڕیاری دا عومرە بکات ، لە خاکی یەمامە دەرچوو ڕووی کـردە مەککـە ، بـە نیازی تەوافی دەوری مەککەو سەرپڕین بۆ بتەکان .

لەکاتێکدا ثومامە لە ڕێگادا بوو نزیـك ببـۆوە لـە شـاری مەدینـە شتێکی بۆ دابەزی کەوا خۆی لەم باوەڕەدا نەبوو .

ئەمەش پۆلێك لە پۆلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لـەدەوری شـاری مەدینە دەسوڕایەوە لە ترسی ئەوەی نەوەکو پیاو خراپێك پێ بنێتـە ناو شارەکەیانەوە و نیازی خراپەی هەبێت

ئەم پۆلە ثومامەی بە دیل گرت لە کاتێکدا نەیاندەزانی کێیە، وە هێنایان بۆ مەدینە ، لە یەکێك لە کۆلەگەکانی مزگەوت بەستایانەوە ، چاوەڕێی ئـەوە بـوون پێغەمبـەری پێشـەوا ﷺ خـۆی بێتـە لای و فەرمانێکی لە سەر بدات .

کـاتێك پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەرچـوو بـۆ مزگـەوت وە چـووە ناومزگەوتـەوە بیـنی ثومامـە لـە کۆلەگەیـەك بەسـترایتەوە ، بـە یاوەرەکانی فەرموو :

﴿ ئایا دەزانن کێتان گرتووە ﴾؟

گووتیان : نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ .

فەرمووی : ﴿ ئەمە ثومامەی کوڕی ئوثالی حەنەفییە ، جا لە گەڵ ئەم دیلە باش بن ﴾.

پێغەمبـەری خـوا ﷺ یەکسـەر گەڕایـەوە ماڵـەوە ،بـە ماڵـەوەی فەرموو :

ئەوەی لەلاتانە لە خـواردن کۆیبکەنـەوەو بینـێرن بـۆ ثومامـەی کوڕی ئوثال ، پاشان فەرمانی کرد حوشترەکەی خۆی هەموو ڕۆژ ێـك دووجـار بۆبدۆشـن ، پاشـان شـیرەکەی بـۆ ببـەن ، ئەمانـە هـەمووی کۆتایی پێ هاتن پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بگات وقسـەی لەگەڵ بکات

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای ثومامە و دەیویسـت دڵـی ڕا بکێشێت بۆ ئیسلام وپێی فەرموو:

﴿ چیت لە لایە ئەی ثومامە﴾؟

ئەویش گووتی

ئەی موحەممەد چاکەم لە لایە ، جا ئەگەر بکوژیت یەکیکی خاوەن خوێن دەکوژیت ، وە ئەگەر ببەخشیت ئەوە دەبەخشیە یەکێك سوپاست دەکا ، وە ئەگەر ماڵت بوێت داوا بکە هەرچەندت دەوێت پێت دەدرێت

پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕۆژان لە سەر ئەم حاڵەتە وازی لیٚ هێنا، خواردن وخواردنەوەیان بۆ دەهێناو شیری ووشترەکەیان بۆ دەهێنا ، پاشان هاتەوە لای ، جا فەرمووی:

چیت لە لایە ئەی ثومامە؟

گووتی

هیچم لە لانیە تەنها ئەوەی پێشتر پێم گووتیت

ئەگەر ببەخشیت دە بەخشیتە یەکێك سوپاست دەکا، وە ئەگەر بکوژیت کەسێکی خاوەن خوێن دەکوژیت ، وە ئەگەر ماڵت بوێت داواکە هەر چەندەت بوێت پێت دەدرێت

پێغەمبەری خوا ﷺ جێی هێشت و تاکوو ڕۆژی دواتر هاتەوە لای پێی فەرموو:

چیت لەلایە ئەی ثومامە؟

گووتی

ئەوەم لەلایە کە پێم گووتیت ، ئەگەر ببەخشیت دەبەخشیتە سەریەکێك سوپاست دەکا ، وە ئەگەر بکوژیت کەسێکی خاوەن خوێن دەکوژیت ، وە ئەگەر ماڵت بوێت داواکە هەر چەندەت بوێت پێت دەدرێت

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕێکی لە یاوەرەکانی دایەوەو فەرمووی ثومامە بکەنەوە ، جا کردیانەوەو بەڕەڵایان کرد

❁ ❁ ❁

ثومامە مزگەوتی پێغەمبەری خوای ﷺ جێهیشت ، ڕۆیشت تاکوو گەیشتە دار خورماکانی دەوری مەدینە ـ نزیك بەقیع ـ ئاوی لێبوو ، بارەکەی لەم شوێنە داخست و لە ئاوەکە خۆی شوشت بە باشترین

شوشتن ، پاشان یەکسەر گەڕایەوە لای مزگەوت ، جا هەر کە گەیشتەوە لە نێو کۆمەڵێك موسڵمان وەستا وگووتی :

( أشهد أن لااله الا الله واشهد أن محمداعبده ورسوله).

پاشان ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ گووتی :

ئەی موحەممەد ، سوێند بە خوا هیچ کەسێك لە سەر ڕووی زەوی زیاتر ڕقم لێی نەدەبۆوە هەروەك ئەوەی ڕقم لە تۆ دەبۆوە ، ئێستا وام لێهاتووە تۆم لە هەموو کەسێك خۆشتر بوویت .

سوێند بەخوا ڕقم لە هیچ ئایینێك نەدەبۆوە هەروەك ڕقم لە ئایینەکەت دەبۆوە ، ئێستا ئایینەکەی تۆم لە هەموو ئایینێك زیاتر خۆش دەوێت .

سوێند بەخوا هیچ شارێك نەبوو ڕقم لێی ببێتەوە هەروەك ڕقم لە شارەکەی تۆ دەبۆوە ، ئێستا وام لێ هاتووە ولاتەکەی تۆم لە هەموو ولاتێك خۆشتر بوێت .

پاشان ئاوڕی دایەوەو گووتی :

بە ڕاستی من خوێنی هەندێك لە یاوەرەکانی تۆم لە سەرە ، جا چیم لەسەر دادەنێیت ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:

**﴿ لاتثريب عليك يا ثمامة ، فان الاسلام يجبُّ ما قبله ، وبشره بالخير الذي كتبه الله له باسلامه ﴾.**

واتە : ﴿ ئەی ثومامە ئێستا هیچت لە سەر نیە ، بەڕاستی ئیسلام ئەوانەی پێشە خۆی سڕیتەوەو مزگێنی داوە بە چاکە کەوا خوا بە موسڵمان بوونی بۆی نووسیوە ﴾.

دەم وچاوی ثومامە گەشایەوەو گووتی :

سوێند بە خوا دەبێت چەند قات بە سەر هاوبەش پەیداکەران بێنم لەوەی بە یاوەرەکانتم کردووە ، وە دەبێت خۆم و شمشێرەکەم و ئەوەی لە گەڵمە بە کار بهێنم لەسەر خستنی تۆو سەرخستنی ئایینەکەت .

پاشان گووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێزەکەت منیان گرت و منیش دەمەوێت عومرە بکەم جاچی دەڕوانی بیکەم ؟
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:
بڕۆ بۆ بەجێهێنانی عومرەت بەلاّم لە سەر ڕێبازی خواو پێغەمبەرەکەی ، ئینجا فێری کرد چی بکات بۆ بە جێهێنانی عومرەکەی .

۞ ۞ ۞

ثومامە ڕۆیشت بۆ ئامانجەکەی تاکوو گەیشتە ناو مەککە ، وەستا بە دەنگێکی بەرز گووتی :
( لبيك اللهم لبيك ، لبيك لا شريك لك لبيك ، ان الحمد وا لنعمة لك والملك ، لا شريك لك ).
جا ثومامە بوو بە یەکەمین موسڵمان لەسەر ڕووی زەوی بچێتە ناو مەککەو بە ئاشکرا ئەم خوا پەرستییە ئەنجام بدات .
قوڕەیشیەکان گوێیان لە دەنگی ( تەلبیە ) بوو جا بە تووڕەیی و هاری با ڵیان گرت ، شمشێرەکانیان لە کالاّن دەرهێنا و ڕوویان کردە جێگای ئەم دەنگە ، بۆ کوشتنی ئەو کەسەی لانەی لەوان تێك داوە .
کاتێك کۆمەڵەکە گەیشتنە لای ثومامە دەنگی تەلبیەی بەرز کردەوە ، تەماشای کردن بە فیزەوە ، یەکێك لە گەنجە قوڕەیشیەکان هەوڵی ئەوەی دا تیرێکی ئاراستە بکات ، بەلاّم دەستیان گرت و پێیان گوت :
خاکت بەسەر ، ئایا نازانی ئەمە کێیە ؟ ئەمە ثومامەی کوڕی ئوثالە ، پادشای یەمامەیە ، سوێند بەخوا گەر لێی بدەن بە خراپە ، قەومەکەی نانمان دەبڕن ولە برسان دەمانکوژن.
پاشان قەومەکە هاتنە لای ثومامە پاش ئەوەی شمشێرەکانیان لە ناو کالاّن نابۆوە ، گووتیان:
چیتە ئەی ثومامە؟ ئایا وەرگەڕای وئایینی خۆت وباب وباپیرانت گۆڕییەوە ؟
ئەویش گووتی :
وەرنەگەڕاوم ، بەلاّم بە دوای ئایینێکی چاکتر کەوتم ...
بە دوای ئایینی موحەممەد کەوتووم .

پاشان ڕووی تێکردن وگووتی:

سوێند دەخۆم بە پەروەردگاری ئەم ماڵە ( بەیتە ) ، پاش گەڕانەوەم بۆ یەمامە نابێت هیچی تر یەك دەنكە گەنم یان شتێکتان پێ بگات تاکوو هەر هەمووتان بەدوای ئایینی موحەممەد ﷺ نەکەون .

ثومامەی کوڕی ئوثال لە پێش چاوی قورەیش عومرەی کرد هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردبوو، قوربانی کوشتەوە بۆ نزیك بوونەوە لە خوا نەوەکو لە بتەکان و خوا دەستکردەکان ، کە ڕۆیشتەوە وولاتەکەی فەرمانی کرد بە میللەتەکەی خواردن لە قورەیش ببڕن ، ئەوانیش گوێڕایەڵیان کرد و خێراتەکانیان لە خەڵکی مەککە بڕی

ئینجا گەمارۆی ثومامە لەسەر قورەیش ڕۆژ بە ڕۆژ توندتر دەبوو لە سەریان ، بۆیە نرخ هەڵسا وبرسیەتی لە ناو خەڵك بلاوەی کرد وئەم کارەساتە لەسەریان توندتر بوو ، تاکوو لەخۆیان ومنداڵەکانیان ترسان بفەوتێن لە برسان .

لەم کاتەدا بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ نووسی وگووتیان:

ئەوەی لە تۆمان زانیوە داوای پەیوەندی خزمایەتی دەکەی و گوێڕایەلی بۆ ئەمە ، وا ئێستا بە ڕاستی تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەبڕی ، باوکانت بە شمشێر کوشتووە و نەوەکانیش لە برسان دەکوژیت . هەروەها ثومامەی کوڕی ئوثال خواردنی لەسەرمان قەدەغە کردووە و زیانمان پێ دەگەیەنێت ، ئەگەر لێی ڕادەبینی شتێکی بۆ بنووسە وەگەر شتێکت بۆ ئێمە پێ دەکرێت بۆمان بکە

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ثومامەی نووسی گەمارۆیان لە سەر لاببات ، ئەویش لایبرد .

ثومامەی کوڕی ئوثال ژیانی درێژ بۆوە ، بەوەفا بوو بۆ ئایینەکەی و پەیمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ پاراست ، جاکاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە پەروەردگار ، عەرەبەکان پۆل پۆل ویەك یەك لە ئایینی خوا هەڵدەگەڕانەوە ، موسەیلەمەی درۆزن لە ( بنی حنیفە ) هەڵسایەوە و داوای کرد بڕوای پێبهێنن ، ثومامە لە بەرامبەری وەستا و بە قەومەکەی خۆی گووت:

ئەی بەنی حەنیفە ئاگادار بن لەم کارە بەدەی کەوا ڕووناکی پێوە نیە ، سوێند بە خوا ئەمە بەدبەختە کەوا بڕوای پێ دەکا، وە کارەساتە ئەوەی بەرامبەری ناوەستێت .

پاشان گووتی:

ئەی بەنی حەنیفە بە ڕاستی دوو پێغەمبەر لە کاتێك کۆ نابنەوە ، موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو هیچ پێغەمبەرێکی لە دوا نیە وهیچ پێغەمبەرێکیش لە گەڵی هاوبەش نیە.

پاشان ئەمەی بۆ خوێندنەوە :

﴿ حم ، تنزيل الكتاب من الله العزيز العليم ، غافر الذنب وقابل التوب شديد العقاب ذي الطول لااله الا هو اليه المصير ﴾ .

پاشان گووتی :

ئەمەیە قسە ی خوا و ئەمەش قسەی موسەیلەمەی درۆزنە :

( يا ضفدع نقي ما تنقين ، لاالشراب تمنعين ولا الماء تكدرين ).

پاشان ئەوانەی مابوونەوە لەسەر ئیسلام لە میللەتەکەی کۆبوونەوە و ڕۆیشتن بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان و جیهادیان لە ڕێگەی خواو بەرز کردنەوەی ووشەکەی کرد لە سەر ڕووی زەوی.

**خوای گەورە پاداشتی ثومامەی کوڕی ئوثال لە سەر ئیسلام بداتەوە ،خوای گەورە ڕێزی لێ بنێت بە بەهەشتەکەی کەوا بەڵێني داوە بە خواترسەکان ، خوا لە ئێمەی گوناهباریش خۆش ببێت و لە گەڵ ئەم یاوەرە بەڕێزانەدا کۆمان بکاتەوە .**

# (١٠٣)

## أبوالعاص كوڕی ڕەبیع

**أبوالعاص قسەی لەگەڵ کردم ڕاستگۆ بوو لەگەڵم وبەڵێنی پێدام بەوەفابوو بۆم (محمدرسول الله ﷺ)**

# ﴿١٠٣﴾
# أبوالعاص كوڕی ڕەبیع
## أبوالعاص قسەی لە گەڵ کردم ، ڕاستگۆ بوو لە گەڵم و بەڵێنی پێدام ، بە وەفا بوو بۆم

محمد رسول الله ﷺ

أبو العاص كوڕی ڕەبیعی عەبشەمی قوڕەشی ، گەنجێك بوو بە هەموو مانایەكی گەنجایەتی ، تاكوو بلێیت ڕێكوپێك وجوان بوو ،گەنجێكی ڕووخۆش بوو ، نازونیعمەت سێبەری لێكردبوو ، لەگەڵ گەورەیی بنەماڵەی ببوو بە نمونەی سوارچاكی عەرەب ، بە هەموو سیفەتێكی فیز لێدان و، نیشانەیەكی پیاوەتیو وەفایی ، شانازی كردن بە هەمووڕەوشت و یاسایەكی باوك وباپیران .

أبوالعاص خۆشەویستی بازرگانی لە قوڕەیش بۆ مابۆوە ، كەوا دووگەشتیان دەكرد ـ گەشتی زستان وگەشتی هاوین ـ كاروانەكانی بەردەوام دەهاتن ودەچوون لە نێوان مەككەو ولآتی شام ، كاروانی أبوالعاص پێكهاتبوو لە سەد ووشتر ودووسەد پیاو ، خەڵك ماڵی خۆیان لە پێش دادەنا بۆ ئەوەی بازرگانیان بۆ بكات چونكە تاقیكرابۆوە سەبارەت بە ژیری و ڕاستگۆیی و دەستپاكی .

هەروەها پلكی ( خەدیجەی كچی خوەیلید) خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ أبوالعاصی لە جێگای كوڕی خۆی دادەنا ، لە دڵ ودەروون وماڵەكەی شوێنێكی پڕشنگداری كردبۆوە .

خۆشەویستی أبوالعاص لە لایەن محمدی كوڕی عبدالله ﷺ كەمتر نەبوو لە خۆشەویستی خەدیجە بۆی .

چەند ساڵانێك بە سەرچوو لە سەر ماڵی محمدی كوڕی عبدالله ﷺ ، زەینەبی كچی گەورەی عازەب بوو ، هەروەكوو گوڵێكی پاك دەگەشایەوە ، ئەوەبوو زۆر لە گەنجانی بە بنەماڵە و گەورە پیاوانی شاری مەككە دەهاتن بۆ خوازبێنی ...

ئەمەش چۆن وانەبێت ؟! كچێك لە ڕەسەنترین كچانی قورەیش بێ و لە وەچەو بنەماڵەو ، بەرێزترین وپاكترین وبە ڕەوشتترین دایك وباوك ... بەڵام زۆر دوور بوون دەستیان بیگاتێ و بیخوازن .

لە بەر ئەوەی كوڕە خاڵی أبوالعاص گەنجترین گەنجانی مەككەبە پێشیان كەوت ...

ماوەیەكی زۆری نەبردلەسەر هاوسەرێتی زەینەبی كچیموحەممەد ﷺ و أبوالعاص بەڵكو چەند ساڵێكی دیاریكراو ، تاكوو دەڤەری مەككە ڕووناك بۆوە بە ڕووناكی دینی خوا ، خودا پێغەمبەرەكەی موحەممەدی ﷺ ڕەوانە كرد بەئایینی هەق و هیدایەت ، فەرمانی پێكرد هۆزەكەی و نزیكەكانی بترسێنێت ، جا یەكەمین كەس لە ئافرەتان خەدیجەی كچی خوەیلید موسڵمان بوو ، پاشان كچەكانی زەینەب وروقیەو ( أم كلثوم ) و فاطمە ، لە گەڵ ئەوەی فاطمە لەم كاتەدا كچكە بوو ...

بەڵام هەرچیأبوالعاص بوو پێی ناخۆش بوو واز لە ئایینی باوك وباپیرانی بهێنێت ، ڕازی نەبوو بچێتە ناو ئایینێك كەوا خێزانەكەی زەینەب چووبووە ناویەوە ، لە گەڵ ئەوەی بەو پەڕی خۆشەویستی خۆشی دەویست ...

كاتێك ناكۆكی كەوتە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و قورەیش ، هەندێكیان بە هەندێكیان گووت :

خاكتان بە سەر ... بە ڕاستی ئێوە خەمتان لەسەر موحەممەد هەڵگرتووە بەوەی گەنجەكان كچەكانی ئەویان هێناوە ، جا ئەگەر كچەكانی بە سەردا بدەنەوە ئەوا بەم ئافرەتانە خەریك دەبێت.

ئەوانیش گووتیان :

ئەوەی بیرتان لێی كردۆتەوە باشترین بیر وڕایە ، جا چوونە لای أبوالعاص وپێیان گووت :

ئەی أبوالعاص خێزانەكەت تەڵاق بدەو ڕەوانەی ماڵی باوكی بكەوە ، ئێمە ژنێكی ترت بۆ دەهێنین ، چۆنی حەز دەكەیت لە جوانترین و ژیرترینی كچانی قورەیش ...

ئەویش گووتی:

نەخێر سوێند بە خوا ، من خێزانی خۆم تەڵاق نادەم و بە هەموو ئافرەتانی دونیا نایگۆڕمەوە ...

بەلأم هەردوو کچەکەی ڕوقیەو ( أم کلثوم ) تەلأق دران وڕەوانەی ماڵی باوکیان کرانەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ کەیف خۆش بوو بە گێڕانەوەیان ، هیوادار بوو کەوا أبوالعاص وەکو ئەوانی تر ئەو کارەی بکردبا ،بەلأم لەم کاتەدا ئەم هێزەی نەبوو بۆ ئەوەی بە زۆری ئـەم کارەی پێبکا ، تا ئـەو کاتە ڕێگەی پێنەدرابوو بە حەرام کردنی مانەوەی ئافرەتی بڕوادار لـەلای هاوبەش پەیداکەردا.

کـاتێك پێغەمبـەری خـوا ﷺ کۆچیکـرد بـۆ مەدینــە ، لـەم شـوێنە کارەکـانی خـۆی تووند کــردو قوڕەیشـیەکان دەرچـوون بـۆ جـەنگی موسڵمانان لە بەدر ، أبوالعاص بە ناچاری لە گەڵیان دەرچوو ...

لە کاتێکدا حەزی نەدەکرد جەنگی موسـڵمانان بکـا و دڵـی بۆ ئـەم جەنگـە نـەدەچوو ، بـەلأم پلەوپایـەي لـە نـاو میللەتەکـەی وایلێکرد لـە گەڵیان دەر بچێت ...

هـەروەها جـەنگی بــەدر بــووە هــۆی شکســتێکی بــێ وێنــەی قوڕەیشیەکان و لووتیان گەیشتە زەوی و پشتی تاغوتـەکانیان پــێ شکا، جا چینێکیان کوژران و چینێکیان بە دیل گیران و ئەوانی تریش پشتیان هەڵکردو ڕزگاریان بوو .

یەکێك لە دیلەکان أبوالعاص پیاوی زەینەبی کچی پێغەمبەری خـوا ﷺ بوو .

پێغەمبەری خوا ﷺ فدیـەی لەسـەر دیلـەکان فـەرز کـرد بـۆ ئـەوەی خۆیانی پێ بکڕنـەوە ، ئینجـا ئـەم کڕینـەوەش لـە نێـوان هـەزار درهـەم وچـوار هـەزار درهـەم بـوو ، بـە گوێـرەی پلـەو پایـەی دیلەکـە لــە نــاو میللەتەکەی و ڕاددەی دەوڵەمەندی.

جا نوێنـەرەکان دەهـاتن ودەچـوون لـە نێـوان مەککەومەدینــە ماڵیان لە گەڵ خۆیان هەڵگرتبوو بۆ ئازاد کردنی دیلەکانیان .

زەینـەب نوێنـەری خـۆی ڕەوانـەی مەدینـە کـرد کـەوا فیدیــەی پیاوەکـەی أبوالعـاص لـە گـەڵ خــۆی هــەڵگرتبوو ، پێکـهاتبوو لــە خەناوکەیەك کەوا دایکی ( خەدیجەی کچی خوەیلید) ـ خوا لێـی ڕازی بێت ـ کـاتی خـۆی کردبـووی بـە دیـاری بـۆ کچـی گـەورەی لـە ڕۆژی گواستنەوەی .

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بینی ڕوخساری پیرۆزی بە پەڕۆکێکی تەنك داپۆشی لە بەر خەم وپەژارە ، ئەوەبوو زۆر بەزەیی بە کچە خۆشەویستەکەی هاتەوە و ڕووی لە یاوەرەکانی کردو فەرمووی :

**﴿ ان زینب بعثت بهذا المال لافتداء أبي العاص ، فان رأیتم أن تطلقوا لها أسیرها و تردوا علیها مالها فافعلوا . فقالوا : نعم ، ونعمة عین یا رسول الله ﷺ ﴾ .**

واتە : ﴿ زەینەب ئەم ماڵەی ڕەوانە کردووە بۆ ئازادکردنی أبوالعاص ، جا ئەگەر بە چاکی دەزانن ،دیلەکەی ئازاد بکەن و ماڵەکەی بۆ ڕەوانە بکەنەوە ئەوا بیکەن ، ئەوانیش پێیان گووت: بەڵێ ... ئەوەی دەکەین لە بەر دڵخۆشی تۆ ئەی پێغەمبەری خواﷺ ﴾ .

لە گەڵ ئەمەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ مەرجێکی لە سەر أبوالعاص دانا پێش ئەوەی ڕزگاری بکات ، کەوا کچەکەی زەینەبی بۆ بنێرێتەوە بە بێ سستی کردن .

جا هەر کە أبوالعاص گەیشتەوە مەککە بە وەفایی خۆی بە جێ هێنا بەم پەیمانەی بە پێغەمبەری خوای ﷺ دابوو .

۞ ۞ ۞

جا فەرمانی کرد بە خێزانەکەی بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئەم کۆچە ، هەواڵی پێدا کەوا نوێنەرەکانی باوکی لە نزیك مەککە چاوەڕوانی دەکەن ، ئەوەبوو خواردنی ڕێگای بۆ ئامادە کرد و عەمری کوڕی ڕەبیعی برای لە گەڵ ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی دەست بە دەست تەسلیمی پیاوەکانی بکاتەوە .

عەمری کوڕی ڕەبیع کەوانەکەی لە سەر شانی خۆی دانا لە گەڵ جۆرکی تیرەکانی ، زەینەبی خستە ناو کەژاوەکەی ، بە نوێژی نیوەڕۆ لە بەر چاوی قورەیش زەینەبی لە مەککە بردە دەرەوە ، جا قورەیشیەکان چاویان چووە پشتی سەریان و پەلاماریان بۆ هێناو زۆری نەبرد پێی گەیشتن ، زەینەب ترسی گەیشتێ و زۆر ترسا .....لەم کاتەدا عەمر کەوانەکەی لە سەر ملی خۆی هێنایە خوارەوە وتیرێکی خستە ناویەوە و ڕووی تێکردن وگووتی :

( واللە لا يدنو رجل منها الا وضعت سهما في نحره ) .

واتە : سوێند بە خوا هەر پیاوێك نزیك بێتەوە لێی ئەوا تیرێك بە قورگی دەکەوێت ، شایانی باسە عەمر تیرهاوێژێك بوو بە هیچ جۆرێك تیرەکانی هەڵەی نەدەکرد ...

ئەوەبوو ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب لێی چۆوە پێشەوە ـ لە کاتێکدا تازە بە کۆمەڵەکە گەیشتبوو ـ پێی گووت:

ئەی برازام ، تیرەکەت لە کەوانەکەت بهێنە خوارەوە تاکوقسەت لە گەڵ بکەین ، ئەویش وازی لێ هێنان ،جا پێیان گووت :

تۆ بە ڕاستی ئەمەی کردووتە هەڵەت نەکردووە ...

بەڵام تۆ لە گەڵ زەینەب بە ئاشکراو لە بەرچاوی خەڵك ولەبەر چاوی ئێمە دەرچوویت ...

لە کاتێکدا هەموو عەرەب کاری شکست خواردنیان لە بەدر پێکەوتووە ، ئەوەی تووشمان بوو بە دەستی باوکی ئەم کچە بوو کە موحەممەدە ...

جا ئەگەر دەربچیت لە گەڵ کچەکەی بە ئاشکرایی ـ هەروەك کردت ـ ئەوا هۆزەکانت هەر هەمووی بە ترسنۆك داناو سووك و چروکت کردن ، جا بیگێڕەوە ، چەند ڕۆژێکی تر لە ماڵەوە بیهێڵەوە تاکوو خەڵك بزانن ئێمە گەڕاندیتمانەوە ، ئەو کاتە بە نهێنی لە ماڵەوە دەریبهێنەو بیگەیێنە بە باوکی ، جا ئێمەش بۆ بەندی بکەین خۆ هیچ پێویستیمان پێی نیە ...

جا عەمر بەمە ڕازی بوو ، زەینەبی گێڕایەوە بۆ مەککە...

پاشان ئەوەندەی نەبرد بە گەڕانەوەی پاش چەند ڕۆژێکی کەم لە کاتی شەو دا بەڕێیکردو تەسلیمی نوێنەرەکانی باوکی کرد دەست بە دەست هەروەك براکەی بۆی وەسف کردبوو .

أبوالعاص لە مەککە مایەوە پاش جیابوونەوەی خێزانەکەی ماوەیەك ، تاکوو پێش فەتحی مەککە بە کەمێك ، دەرچوو بۆ شام بە مەبەستی بازرگانی ، کاتێك لە شام دەگەڕایەوە بۆ مەککە باری ووشترەکانیشی پێبوو کەوا دەگەیشتە سەد ووشتر و پیاوەکانی نزیکەی سەدو حەفتا پیاو دەبوون ، تووشیان بە تووشی پۆلێك لە پۆلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نزیك مەدینە ، جا هەموو بارەکەیان گیرا لە

گەلّ بە دیل گرتنی پیاوەکانی،بەلاّم هەرچی أبوالعـاص بـوو لەدەسـتیان ڕزگاری بوو...

جا کـاتێك شـەو تـاریکی داهێنـا أبوالعاص لــە تـاریکی شــەو دەمامکی خۆی دا وبـە تـرس لـەرزەوە چـووە نـاو مەدینـە ، ڕۆیشـت تاکوو گەیشتە زەینەب ، ئەوەبوو پەنای بۆ برد ئەویش پەنای دا.

❁ ❁ ❁

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ نوێـژی بەیانی ، ڕاوەستا لە میحراب و تەکبیری ئیحرامـی لێدا خـەڵکی لـە گـەلّ تـەکبیری ئـەو تەکبیریان لێـدا ، زەینـەب لـە نـاو کۆمـەڵێك ئـافرەت هـاواری کـرد و گووتی:

ئەی خەڵکینە ، من زەینەبی کچی موحەممەدم ،أبوالعاص پەنـــای بـۆ هێنـاوم ، دە ئێـوەش پـەنای بـدەن ، کـاتێك پێغەمبـــەری خـوا ﷺ سەلامی نوێژی دایەوە ، ڕووی لە خەڵکەکەکرد و فەرمووی:

﴿ هل سمعتم ما سمعت ﴾ ؟!

واتە : ﴿ ئایا گوێتان لەمە بوو کەوا گوێم لێی بوو ﴾؟!

گووتیان :

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ .

فەرمووی :

سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە بە هیچ شتێکم نەزانیوە لەمـە، تـاکوو ئـەوەی گوێم لێـی بـوو ، ئێـوەش گوێتـان لێـی بـوو، ئینجـا موسڵمانیش پـەنای لـە خـۆی نزمـتر دەدا ، پاشـان چۆوە ماڵــەوە بــە کچەکەی فەرموو :

ڕێز لە أبوالعاص بنێ وبزانە تۆ بە ڕاستی حەلاڵی ئەم نیت ، پاشـان بانگی ئەو سریەی کرد(کەناوی سریەی أبوبصیربوو ) کەوا کاروانەکـەیان گرتبوو ، وە پیاوەکانیان بە دیل گرتبوو ، پێی فەرموون :

بە ڕاستی ئەم پیـاوە لـە ئێمەیـە هـەروەك دەزانـن ، ئێوە ماڵتـان گرتووە ، ئەگــەر چاکـەی لـە گـەلّ بکـەن وماڵەکـەی بـۆ بگێڕنـەوە کـەوا خاوەنەکـەیتی ئێمـە حـەز دەکـەین ، ئەگـەر پێشـی نەدەنــەوە ، ئــەوە دەسکەوتەو لێتان حەلاڵە و ماڵی ئێوەیە .

ئەوانیش گووتیان :

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵکو ماڵەکەی بۆ دەگێڕینەوە .

جا کاتێك هات ماڵەکە وەربگرێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو ئەی أبوالعاص :

تۆ بە ڕاستی لە ماقوڵانی قوڕەیشیت ، تۆ زاواو کوڕە مامی پێغەمبەری خوایت ﷺ ، جا بۆچی موسڵمان نابیت ؟ ئێمە ماڵەکەت هەر هەموو پێ دەدەینەوە لەماڵی خەڵکی مەککە ، وە لە گەڵمان لە مەدینە بمێنەوە ماڵەکە بۆ خۆت دەبێت.

ئەویش گووتی:

خراپترین شتە ئەوەی داوای دەکەن لێم ، بۆ یەکەم جار بە ناپاکی بێمە ناو ئایینی نوێ .

أبوالعاص بە خۆو بەبارەوە ڕۆیشتەوە بۆ مەککە ، کاتێك گەیشتەوە ماف هەموو خاوەن مافێکی دایەوە ، پاشان گووتی:

ئەی کۆمەڵی قوڕەیش هیچ کەسێك ماڵی لە لای من ماوە نەمدابێتەوە ؟؟

گووتیان :

نەخێر خوا پاداشتی چاکەت لە سەر بداتەوە ، بە ڕاستی لە گەڵ ئێمە بە وەفاو بەڕێز بوویت .

ئەویش گووتی:

هەرچی منم مافەکانی ئێوەم هەموو دایەوە ، ئینجا من شاهێدی دەدەم کە :

## أشهد أن لااله الاالله وأن محمدا رسول الله.

سوێند بە خوا هیچ شتێك قەدەغەی نەکردووم بچمە ناو ئیسلام لای موحەممەد لە مەدینە تەنها لەوە دەترسام گومانم پێ ببەن کەوا من نیازی ئەوەم بووبێ ماڵتان بخۆم ...

جا کاتێك خودا وایکرد ماڵەکەتان بۆ بگێڕدرێتەوە و هیچم لە سەر نەما موسڵمان بووم .

پاشان دەرچوو تاکوو گەیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ جا ئەویش ڕێزی لێ گرت و خێزانەکەی بۆ گێڕایەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەقی ئەم یاوەرە بەڕێزە دەیفەرموو :
﴿ حدثني فصدقني ، ووعدني فوفى لي ﴾ .
واتە : ﴿ قسەی لە گەڵ کردم و ڕاستی کرد لە گەڵم ، بەڵێنی پێدام بۆم بەوەفا بوو﴾ .

**ڕەزای خودا لە یاوەری ڕاستەڕێ وبە وەفـــا و زاوای پـــاکی پێغەمبەری خوا ﷺ ابوالعاص کوڕی ڕەبیع ، لە خوای گەورەش دەپاڕێینەوە ئەم سیفات وئاکارە جوانانەی ئەم یاوەرانـــە لـــە دەروونی گوناهباری ئێمە ڕەنگ بداتەوە و بۆ ئیسلام هـــەردەم دڵسۆز و بە وەفا بین.**

# (١٠٤)

# عەدی کوری حاتەمی طائی

**ئەوپادشایەی بیست ساڵ**
**دوژمنایەتی ئیسلامی کرد پاشان**
**گەڕایەوە باوەشی ئیسلام**

# ﴿١٠٤﴾
# عەدی کوڕی حاتەمی طائی
## ئەو پادشایەی بیست ساڵ دوژمنایەتی ئیسلامی کرد پاشان گەڕایەوە باوەشی ئیسلام

لە ســـالی نۆیەمی کۆچی پادشایەك لە پادشاکانی عــەرەب ملکەچ بوو بۆ ئیسلام پاش پشت هەلکردنی لە ئیســلام ، بۆ ئیمـان دلـی نـەرم بوو پاش ئەوەی دژی دەوەستا و کۆسپی دەخستــەبەر ، هــەروەهــا پاش یاخی بوون گویرایەل بوو بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ

ئەمـەش عـەدی کــوری حاتــەمی طائیــە کــەوا بــاوکی نموونــەی سەخاوەت بوو

عەدی سەرکردایەتی بۆ لە باوکی مایەوەو بووبە سەرکردەی طـائی وچواریەکی دەستکەوتەکانی دەدرایی وسەرکردایەتی درا دەست

کاتیك پیغەمبەری خودا ﷺ بانگی هـەق وهیدایەتی ئاشکرا کــرد ، عەرەب یەك یەك بۆی ملکەچ دەبـوون ، عـەدی وای تـیروانی بانگەکـەی پیغەمبــەری خوا ﷺ لەوانەیە سەرکردایەتی لە دەست ئــەو بسینیتەوە ، گەورایەتی پیغەمبەری خوا ﷺ گەورایەتی ئەو نەهیلیت ، جابـەتوندترین شیوە دوژمنایەتی پیغەمبەری خوای ﷺ دەکرد

لە کاتیکدا نەیدەناسی

لە هەموو کەس زیاتر رقی لیدەبۆوە پیش ئەوەی بیبینیت

بەم جۆرە دوژمنایەتی ئیسلامی کرد نزیکەی بیست سال تاکوو خوای گەورە سینگی جۆش دا بۆ بانگی هەق وهیدایەت .

عەدی کوری حاتەم داستانیکی هەیە لە گەل ئیسلام هەرگیز لە یاد ناکریت

جا ئەم داســتانە لی دەگــەریین بـۆ خـاوەنی داستانەکە ، لەبـەر ئـەوەی خۆی شیاوترەو ئاگادارترە بۆ گیرانەوەی داستانەکە

عەدی دەڵێت :

هیچ پیاوێك نەبوو لە عەرەب وەکوو من ڕقی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ببێتەوە ، کاتێك ناوی بەر گوێم کەوت ، من پیاوێکی ناودارو ماقوڵ بووم ،گاور بووم وچارەك ببوو بە پیشەم لە ناو میللەتەکەم ، جا چارەکم لە دەسکەوتەکانیان وەردەگرت ، هەروەکو پادشاکانی تری عەرەب کاریان پێدەکرد .

کاتێك گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ڕقم لێی بۆوە ، ئەوکاتەی کارەکەی گەورە بووهێزی پەیدا کرد ، سوپاو پۆلەکانی بلاوەی کرد لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای خاکی عەرەب ، بە غولامەکەی خۆم گووت کەوا ووشتری بۆ دەلەوەڕاندم :

لەبەر چاوی باوکت وون بیت ، چەند ووشترێکی قەڵەوی خۆشڕەوم بۆ ئامادە بکە و لە نزیکی من بیانبەستەوە ، من گوێبیست بووم بەوەی سوپای موحەممەد و پۆلەکانی دەسوڕێنەوەو دەستیان بە سەر ئەم وولاتە داگرتووە

ڕۆژێکیان کاتی نیوەڕۆ غولامەکەم هاتە لام و پێ گووتم

ئەی گەورەم ،ئەم نیازەی دەتویست بە کاری بهێنی ئێستا بە جێی بهێنە ، وا هێزەکانی موحەممەد دەستیان بە سەر ئەم خاکە داگرت. جا پێم گووت

کوانێ ؟! لەبەر سکی دایکت هەلگیرێیت .

گووتی

من بە ڕاستی بینیم ئاڵاکانیان دەشەکێتەوە لەم شوێنە ، پرسیارم لێیان کرد ، پێیان گووتم:

ئەمە سوپای موحەممەدە ﷺ

جا پێم گووت :

ئەم ووشترانەم بۆ ئامادە بکە کەوا فەرمانم پێ کردبوویت بەئامادە کردنیان و نزیك کردنەوەیان لێم .

پاشان خۆم ئامادە کرد جا داوام لە کەسوکارو مندالەکانم کرد بۆ کۆچ کردن بۆ ئەم شوێنەی حەزم پێی دەکرد وبە پەلە ڕۆیشتم بۆ ئەم وولاتەو بۆئەوەی بگەم بەبرا دیینیەکانم لە گاوران ولایان بمێنمەوە

به ڕاستی ئەم کارە پەلەی لێکردم لە کۆکردنەوەی کەسوکارم ، کاتێك لە شوێنی ترسناك ڕزگاریم بوو ، سەرژمێری کەسوکارم کرد ، بینیم خووشکێکم جێ هێشتووە لە ناوچەیەك لە نەجد لە گەڵ ئەوانەی لە هۆزی طائی بەجێمابوون ، ڕێگام نەما بۆ گەڕانەوە بۆ لایان ، جا لەگەڵ ئەوانەی لە گەڵم بوون ڕۆیشتین تاکوو گەیشتینە شام ، لەم شوێنە لەگەڵ برا دینیەکانم جێنشین بووم

هەرچی خوشکەکەم بوو تووشی ئەو شتە بوو کەوا من لێی دەترسام

کاتێك لە وولاتی شام بووم هەواڵم پێگەیشت هێزەکانی موحەممەد هێرشیان بردۆتە سەر ناوچەکانمان وخوشکەکەی من لە گەڵ ئەوانەی کەوتبوونە دەست ، براوە بۆ یەثریب ( مەدینە )

لێرەدا لەگەڵ کۆمەڵێك لە گیراوەکان لە دەرگای مزگەوت دانرابوون . پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایاندا تێپەڕی و خوشکەکەم گووتی

( یا رسول الله ﷺ ، هلك الوالد وغاب الوافد فامنِن علىَّ مَنَّ الله عليك ).

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، باوکم مردوو لە کەسوکارم دابڕام ، جا منەتم لەسەر بکە خوا منەتت لەسەر بکات .

پێی فەرموو:

﴿ من وافدك ؟ واتە: کەسوکارت کێیە ﴾ ؟

پێی گووت: عەدی کوڕی حاتەم .

پێی فەرموو :

لەبەر خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەلاتووە ؟!

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و وازی لێ هێنا

بۆ بەیانی بەلای دا تێپەڕییەوە هەروەك دوێنێ ئەم قسەی پێ گووتەوە ، ئەویش هەمان قسەی پێ فەرمووەوە

بۆ ڕۆژی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایدا تێپەڕیەوە ئەمجارەیان لێی نائومێد بوو هیچی پێ نەگووت ، جا پیاوێك لە پشتەوە ئاماژەی بۆ کرد کەوا هەڵسێتەوەو قسەی لە گەڵ بکات ، جاگووتی

( یا رسول الله ﷺ هلك الوالد وغاب الوافد ، فامنن علىَّ مَنَّ الله عليك )

واته :( ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، باوکم مرد ولە کەسوکارم دابڕام جا منەتم لەسەر بکە خوا منەتت لە سەر بکات ) .

پێی فەرموو: بۆم کردیت

جا پێی گووت:

من دەمەوێت بگەم بە کەسوکارم لە شام .

پێی فەرموو:

بەڵام بۆ دەرچوون پەلە مەکە تاکوو یەکێك لە میللەتەکەت دەبینیەوە متمانەی پێ دەکەیت تاکوو بتگەیەنێت بە وولاتی شام ، ئەگەر ئەم متمانە پێکراوەت بینیەوە ئاگادارم بکەوە .

۞ ۞ ۞

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ ڕۆیشت پرسیاری ئەم پیاوەی لێکرد کەوا ئاماژەی بۆ کرد قسە بکات ، پێیان گووت:

ئەمە عەلی کوڕی أبو طالب بوو .

پاشان چاوەڕێی کرد تاکوو کاروانێك هات متمانەی پێکرد ، جا هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گووتی:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك لە میللەتەکەم هاتوون جێگای بڕواو متمانەن ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ جلوبەرگی پێدا و ووشترێکی پێ بەخشی ، لەگەڵ هەندێك پارە کەوا بەشی ڕێگای دەکرد، جا لەگەڵ کاروانەکە دەرچوو .

۞ ۞ ۞

عەدی دەڵێت :

پاشان ئێمە چاوەڕێی هەواڵمان دەکرد کە بگاتە لامان ، وە ئێمە بڕوامان نەدەکرد بەم هەواڵەی بۆیان باس دەکردین کەوا موحەممەد بەم رادەیە چاکەی لە گەڵ دەکات

جا سوێند بە خوا من دانیشتبووم لە نێو کەسوکارم ، کاتێك ئافرەتێکم لە ناو کەژاوەکەیدا بینی دەهات بۆ لامان ، جا گووتم : دەبێ کچی حاتەم بێت ، هەوبوو هەوبوو ، کاتێك بەرامبەرمان وەستا ئەم قسەی پێ گووتم :

( القاطع الظالم      لقد احتملت بـأهلك وولـدك وتركـت بقيـة والـدك وعوريك ).

واته:( ئەی بێ بەزەیی ستەمکار ، خێزان ومالْ و مندالّت لـە گـەلْ خۆت برد وناموس و خوشکەکانت جێهێشت ).

جا پێم گووت:

ئەی خوشکە هیچ مەلّێ تەنها خێر نەبێت ، ئیتر زۆر هەولّم دا تاکوو رازی بوو چیرۆکی خۆی بۆ گێرامەوە ، ئەمەی بۆ گـووتم وەکـوو ئـەوەی پێم گەیشتبوو ، جا پێم گووت :

ـ لەبەر ئەوەی ئافرەتێکی ژیرو بە بڕیار بوو ـ چۆن لە کـاری ئـەم پیاوە ( پێغەمبەری خوا ﷺ ) دەگەیت ؟

ئەمیش گووتی :

سوێنـد بـەخوا مـن وای بـۆ دەڕوانم زوو بگەیتـە لای ، جـا ئەگــەر پێغەمبەر بێت ئەوەی زوودەگاتە لای گەورە دەبێ ، وە ئەگەر پادشاش بێت لە لای ئەو هەرگیز ڕیسوا نابێت و پیاوەکەی جاران دەبێت .

عەدی دەلّێت :

بارگـەی ســەفەرم ئامــادە کـردو ڕۆیشــتم تــاکوو گەیشــتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە ، بــەبێ پەناوبەبێ‌نامـە ، لـە بـەر ئـەوەی پێم گەیشتبوو فەرمووبووی :

﴿ انی لارجو ان یجعل الله ید عدی فی یدی ﴾...

واتە:من هیواخوازم خوا دەستیعەدی لەناو دەستم بنێت.

چوومە لای لە مزگەوت بوو ، سەلامم لێی کرد ، پێی فەرمووم:

تۆ کێیت ؟

پێم گووت :

عەدی کوڕیحاتەم ، بۆم هەلّسایەوە دەستی گرتم و منـی بـردەوە مالّەوەی

جا سـوێند بـە خـوا دەڕۆیشـتین بـۆ مالّـەوە لـە ڕێگا تووشـی بـە ئـافرەتێکی لاوازی پـیر بـوو منداڵێکـی بچووکـی لـە گـەلْ بـوو ، جـا وەستاندی ودەستی کرد بە قسە کـردن لـە گـەڵی بـۆ پێویسـتیەك ، لـە گەڵیان مایەوە تاکوو پێویستیەکەی بـۆ جێبـەجێکردن و منیـش وەسـتا بووم ، جا لە دڵی خۆمدا گووتم:

سوێند بە خوا ئەمە بە پادشا ناچێت

پاشـان دەسـتی گـرتم منی‌بـردەوە تـاکوو گەیشـتینە ماڵـەوە ، ڕایەخێکی لە لۆکە پێدام و فەرمووی :

لە سەر ئەمە دابنیشە

منیش شەرمم لێی کردو گووتم :

بەڵکو تۆ لە سەری دابنیشە ، ئەویش گووتی:

بەڵکو تۆ ، جا گوێڕایەڵیم کردو لەسەری دانیشتم ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر زەوی دانیشت لە بەر ئەوەی لە ماڵدا لەمە زیاتری نەبوو ، لـە دڵی خۆمدا گووتم :

سوێند بە خوا ئەم کارە کاری پادشایان نیە

پاشان ڕووی تێکردم وفەرمووی:

ئێ ئەی عەدی کوڕی حاتەم ، ئایا تـۆ ڕەکوسـی نـەبوویت ئـایینێك بوو گرتبووت کەوا لە نێوان گاوری وصابئی دابوو ؟؟

گووتم: بەڵێ

پێی فەرمووم:

تۆ لەناو میللەتەکەت کارت بە چارەك نەدەکرد جا لێت وەردەگرتـن ، لە کاتێکدا ئەمە لە ئاینەکەت دروست نەبوو ؟

جا پێم گووت:

بەڵێ ، جا زانیم ئەمە بە ڕاستی پێغەمبەرێکی نێردراوە .

۞ ۞ ۞

پاشان پێی فەرمووم :

ئەی عەدی لەوانەیە ئەم بەربەسـتەی کـە نـاهێڵێت بێیتـە نـاو ئـەم ئایینە ئەوەبێ کە دەبینی موسڵمانان هەژارن، جا سـوێند بـەخوا نزیکـە ماڵیان ئەوەندە زۆر بێت کەس نەبێت لێیان وەرگرێت .

ئەی عەدی لەوانەیە ئـەم بەربەستەی کـە نـاهێڵێت بێیتـە نـاو ئـەم ئایینە ئەوەبێ کە دەبینی ژمارەی موسڵمانان کەمە و ژمارەی دوژمنـان زۆرە ،جا سوێند بەخوا نزیکە گوێبیست بن بە ئافرەتێك لە قادسـیە بـە سواری ووشترەکەی بێت و زیارەتی ئەم ماڵە بکات ولـە کـەس نەترسـێ تەنها لەخوا نەبێت

وە لەوانەیە ئەمە ببێتە بەربەست بۆ ئەوەی نەیەیتە ناو ئەم ئایینـە کەوا تۆ وا دەبینی گەورەیی و پادشا یی بۆغەیری موسـڵمانە ، سـوێند

به خوا نزیکه گوێبیست بن به کۆشـك وتـه‌لاره‌کانی خـاکی بـابل کـه بـه ده‌سـتی ئێمـه بگیرێن ، هـه‌روه‌ها خشـڵه‌کانی کیسـرای کـوڕی هورمـز بکه‌وێته به‌ر ده‌ستمان، پێم گووت:

خشڵی کیسرای کوڕی هورمز ؟!

پێی فه‌رمووم:

به‌ڵێ ، خشڵی کیسرای کوڕی هورمز .

عه‌دی ده‌ڵێت:

له‌م کاته‌دا شاهێدی هه‌قم هێناو موسڵمان بووم .

عه‌دی خوای لێ رازی بێت ته‌مه‌نی درێژ بۆوه ، ده‌یگووت :

به‌ڕاستی دووان هاتنه‌جێ و سێیه‌مین ماوه ، سوێند به‌خوا ده‌بێـت ئه‌مه‌ش بێته جـێ ، ئینجا بـه چاوی خۆم دیتـم ئـافره‌تێك بـه سـواری ووشتره‌که‌ی له قادسـیه ده‌هـات بـه بـێ ئـه‌وه‌ی لـه که‌سـێك بترسـێت ، تاکوو گه‌یشته ئه‌م ماڵه

من یه‌که‌م سوار چاك بووم هێرشم برده سـه‌ر خشـڵه‌کانی کیسـرا و گرتم

سوێندم خوارد به خوا ده‌بێت سێیه‌میشیان بێته‌جێ

خوای گه‌وره‌ش حه‌زی کرد قسه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بێتـه جـێ ، ئه‌وه‌بوو موعجیزه‌ی سێیه‌م هاته پێشه‌وه له زه‌مـانی خه‌لیفـه‌ی زاهیـدو خواپه‌رست ( عومه‌ری کوڕی عه‌بدولعه‌زیز ﷺ ) ، کـاتێك مـاڵی دونیـا ڕژا به‌سه‌ر موسڵمانان بانگیان ده‌کرد کێ هه‌یـه مـاڵی زه‌کـات وه‌رگرێـت بـۆ موسڵمانه هه‌ژاره‌کان ، که‌سیان ده‌ست نه‌ده‌که‌وت .

## ڕه‌زای خودا له یاوه‌ری به‌ڕێزی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ
## عه‌دی کوڕی حاته‌می طائي

# (١٠٥)

## حەکیم کوری حەزام

لە مەککە چوارکەس هەن
شیاوی ئەوە نین گومرابن، پێم
خۆشە موسڵمان ببن... یەکێکیان
حەکیم کوڕی حەزامە محمد رسول الله ﷺ

# ﴿١٠٥﴾
# حەكیم كوری حەزام
## لە مەككە چوار كەس هەن شیاوی ئەوەنین گومرابن ،پیم خۆشە موسلمان بن . . . یەكێكیان حەكیم كوری حەزامە .
محمدرسول الله ﷺ

ئایا هەوالی ئەم یاوەرە بەرێزەت نەبیستووە ؟!
هەروەكو میژوو بۆمانی تۆمار كردووە.تاكە منداڵێكە كەوا لەناو كەعبەی پیرۆز لە دایك بووە
هەرچی چیرۆكی لەدایك بوونیەتی ، ئەمەیە بە كورتی :
دایكی لەگەڵ چەند هاورییەكی هاوشانی خۆی دەچنەناو كەعبە بۆ تەماشا كردن
هەروەها لەم رۆژگارەدا كەعبە كراوەبوو بۆ ئاهەنگیك لە ئاهەنگەكان .
دایكی لەم كاتەدا سكی هەبوو ، لەناكاو لە ناو كەعبە ژانی دیتی ، جا ناتوانیت وبەمە راناگات بگەریتەوە
پیستیكی بۆ دەهینن و منداڵەكەی لەسەر دەبیت
ئەم منداڵەش حەكیم كوری حەزام كوری خوەیلید دەبیت
ئەمیش برازای دایكی برواداران خاتوو خەدیجەی كچی خوەیلیدە (خوا لیی رازی بیت).
حەكیم كوری حەزام لە بنەماڵەیەكی رەسەن وبەریز پەروەردە دەبیت ، كەوا خاوەن سامانیكی زۆر دەبن
لەگەڵ ئەمەشدا پیاویكی ژیرو بەریز دەبیت ، میللەتەكەی بە یەكیك لە گەورەكانی خۆیانیان دادەنیین وپلەی ( الرفادە ) واتە: خزمەتگوزاری پی دەبەخشن ، سەبارەت بە پیویستی ویارمەتی ئەوانەی حەجی ماڵی خوایان دەكرد
حەكیم هاورییەكی گیانی بە گیانی پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ، پیش ئەوەی محمد ﷺ بكریت بە پیغەمبەر .

یەکەمیان  بە دواکەوتنی موسلمان بوونم وام لیهات لە زۆر شوینی گەورەو مەزن پیشم بکەون ، جا ئەگەر پر بە زەوی زیر ببەخشم ناگەم بە شوینی ئەوان .

پاشان خودا لە رۆژی بەدر وئوحود رزگاری کردم ، لەو رۆژەدا لە دلی خۆم گووتم:

پاش ئەمە جاریکی تر یارمەتی قورەیش نادەم بەسەر پیغەمبەری خوا ﷺ ولە مەککە ناچمە دەرەوە ، جا ئەوەندەی پینەدەچوو رایاندەکیشام بۆ یارمەتی قورەیش .

پاشان بە راستی هەر کاتیك دەمویست بیمە ناو ئیسلام ، تەماشای پیاوەکانی قورەیشم دەکرد ئەوانەی بە سالاچوبوون ، هەموویان پابەندن بەوەی لەسەری بوون لە سەردەمی جاهیلیەت ، جا شوینکەوتویان دەبووم و لەگەلیان دەرۆیشتم

خۆزگە ئەم شتانەم نەکردبا

جا هیچ بە هیلاك وفەوتانی نەداین تەنها  شوینکەوتنمان نەبیت بۆ باپیران وگەورەکانمان

جا ئەی رۆلەم چۆن نەگریم ؟!

هەروەك ئیمە سەرمان سورما لە دواکەوتنیموسلمان بوونی حەکیم کوری حەزام ، خۆشی سەری سورما بوو لە دەروونی خۆی لەم کارە ، جا پیغەمبەری خوا ﷺ سەری سورمابوو لە پیاویك وەکو حەکیم کوری حەزام بەم جۆرە ژیرو تیگەیشتوو بیت چۆن ئیسلامی لە پیش چاو وون دەبی وخۆزگەی بۆ دەخواست لە گەل ئەو پیاوانەی هاوشانی خۆی بوون بە پەلەو بە خیرایی بین بۆ ناو ئایینی خوا

جا لەو شەوەی کەوا فەتحی مەککەی تیا کرابوو پیغەمبەری خوا ﷺ بە یاوەرەکانی خۆی فەرموو :

**﴿ان بمكة لاربعة نفر أربأ بهم عن الشرك، وأرغب لهم في الاسلام، قيل :**

**ومن هم يا رسول الله ﷺ ؟**

**قال :**

**عتاب بن أسيد، وجبير بن مطعم، وحكيم بن حزام، وسهيل بن عمرو﴾.**

واته : ﴿ له مەككه چوار كەس هەن شیاوی ئەوە نین گومرا بن و پێم خۆشه موسلمان بن ، گووتیان

ئەمانه كێن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟

فەرمووی

عوتاب كوری ئوسەید ، جوبەیر كوری مرطعیم ، حەكیم كوری حەزام ، وە سوهەیل كوری عەمر ﴾.

جا له گەورەیی خوا ئەمانه هەر هەموویان موسلمان بوون

وە كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چووه ناو شاری مەككه و فەتحی كرد رازی نەبوو تەنها بەوە نەبێت رێز له حەكیم كوری حەزام بگیرێت ، جا فەرمانی دا بە بانگكارەكانی بانگ بكەن :

هەر یەكێك شاهیدی بدات به

( أشهد أن لااله الا الله ، وحده لاشريك له ، وأن محمدا عبده ورسوله ) . ئەوا پارێزراوە

هەر كەسێك لە لای كەعبە دانیشێ و چەكەكەی دابنێت ئەوا پارێزراوە

وە هەر كەسێك دەرگا لەسەر خۆی دابخا ئەوا پارێزراوە

وە هەر كەسێك بچێتە مالی ئەبو سوفیان ئەوا پارێزراوە

وەهەر كەسێك بچێتە مالی حەكیم كوری حەزام ئەوا پارێزراوە

شایانی باسە مالی حەكیم كوری حەزام كەوتبووە لای خوارەوەی مەككەو مالی ئەبو سوفیانیش كەوتبووە لای سەرەوە.

حەكیم كوری حەزام موسلمان بوو بە جۆرێكی وا موسلمان بوونەكەی زال بوو بە سەر هۆش وبیری ، بروایيەكی وای هێنا كە تێكەل بوو لەگەل گۆشت وخوێنی و تا قولایی ناخی رۆچوو .

هەروەها بریاری دا لەسەر دەروونی خۆی كەوا هەر هەلویستێكی خراپی نیشان دابی له سەردەمی جاهیلی و هەر مالێك بەخشی بێتی له دوژمنایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ قەرەبوی بكاتەوە بە چەند جار بە چاكه

بە راستی حەكیم بۆ سوێندەكەی بە وەفا بوو .

نموونەی ئەمانە: حەكیم خاوەنی ( دارالندوه ) بوو ، واته بینایەی كۆبونەوە و پەرلەمانی ئەو كاتە ، كەوا شوێنێكی مێژوویی رەسەن بوو

لەم شوینەدا قورەیشیەکان کۆبونەوەکانی خۆیان دەکرد لە سەردەمی جاهیلی ، تیایدا گەورەو سەرۆکەکانیان پیلانیان دادەنا بۆ کوشتنی پیغەمبەری خوا ﷺ

جا حەکیم کوری حەزام ویستی لەمە رزگاری بیت ، هەروەکو بلییت پەردەیەك بە سەر چاوی خۆی دابد ا بۆ ئەوەی ئەم یادگارە نامۆیە لە یاد خۆی بباتەوە ، جا بینایەی پەرلەمانی فرۆشتەوە بە سەد هەزار درهەم ، یەکیك لە گەنجەکانی قورەیش پیی گووت

( لقد بعت مكرمة قريش يا عم )

واتە ( ئەی مامە ، بە راستی ریزی قورەیشت فرۆشت )

حەکیم ﷺ پیی گووت:

ئەی رۆلەم زۆر دووریت !! هەموو جیگا ریزیك رۆیشت ، بیجگە لە تەقوا هیچی تر نەما ، هەرچی منم نەمفرۆشتووە تەنها بۆ ئەوە نەبیت بە نرخەکەی خانوویەك لە بەهەشت بکرم

❁ ❁ ❁

وە من دەتان کەم بە شاهید کەوا نرخەکەم لە پیناوی خوای گەورە داناوە

حەکیم کوری حەزام ﷺ پاش ئەوەی موسلمان بوو حەجی مالی خوای کرد ، جا سەد ووشتری رازاوە بە بەرگی جوان لە پیشی دەرۆیشت پاشان هەر هەمووی کوشتەوە بۆ نزیك بونەوە لە خوا...

هەروەها لە حەجیکی تر لە عەرەفات وەستا ، سەد بەندەی لەگەل بوو ، لە ملی هەر یەکیکیان مەدالیایەکی زیوین هەبوو ، ئەمەی لەسەر نەخش کرابوو :

عتقاء لله عزوجل عن حكيم بن حزام ...

واتە : ئازاد کران لە پیناوی خوای گەورە لە لایەن حەکیم کوری حەزام

لە حەجی سییەم هەزار مەری بە پیشەخۆی دابوو

بەلی هەزار مەر

هەر هەموی لە مینا سەربری و گۆشتەکەی بەخشی بە سەر هەژارە موسلمانەکان بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورە

پاش جەنگی حونەین حەکیم کوری حەزام داوای دەسکەوتی لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد ، ئەویش پییدا ،پاشان دووبارە داوای

لیکردەوە جا پییدا ، تاکوو ئەوەی وەریگرت گەیشتە سەد ووشتر ( لەو کاتەدا تازە هاتبۆوە ناو ئیسلام ) جا پیغەمبەری خوا ﷺ پیی فەرموو :

**یا حکیم: ﴿ان هذا المال حلوة خضرة**
**فمن أخذه بسخاوة نفس بورك له فيه**
**ومن أخذه باشراف نفس لم يبارك له فيه ، وكان كالذي يأكل ولا يشبع ، واليدالعليا خير من اليد السفلى ﴾.**

واتە ئەی حەکیم ﴿ئەم مالە شیرین وجوانە
هەر کەسیك وەری بگریت وجیگیر نەبیت لە ناو دلی خوا لیی پیرۆز دەکات
وەهەر کەسیك وەریبگریت وجیگیر ببیت لەناو دلی خوا لیی پیرۆز ناکات ، ئەمەش هەروەکو ئەو کەسەیە بخواو چاوی تیر نەبیت ، وە دەستی بەخشەر باشترە لە دەستی وەرگر ﴾.

کاتیك حەکیم کوری حەزام ئەمەی گوی لی بوو لە پیغەمبەری خوا ﷺ گووتی
ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردووە لە پاش تۆ لە کەسی تر داوا نەکەم
هیچ شتیك لە کەس وەرنەگرم تاکوو دەمرم
بە راستی حەکیم بۆ سویندەکەی بەوەفا بوو
لە سەردەمی ئەبوبەکری صەددیق ﷺ زۆر جاران بانگیان دەکرد بەشی خۆی لە ( بیت المال ) وەربگریت بەلام رازی نەدەبوو وەریبگریت
کاتیك ئیمامی عومەر ﷺ جلەوی خەلیفایەتی وەرگرت ئەمیش بانگی کرد بۆ وەرگرتنی بەشی ، دووبارە رازی نەبوو و وەرینەگرت.
عومەر ﷺ لەناو خەلك هەلسایەوەو گووتی:
دەتانکەم بە شاهید ئەی کۆمەلی موسلمانان بانگی حەکیمم کردووە بۆ وەرگرتنی بەش ، نەهاتووە وەریبگریت
بەم جۆرە حەکیم لەسەر ئەم رەفتارە مایەوە تاکوو کۆچی دوایی کرد

## رەزای خوا لە یاوەری لەخوا ترس و چاوتیرو راستگۆ حەکیم کوری حەزام

## ﴿١٠٦﴾
## ضیراری كوری خطاب
## پالەوان وسوارچاكی جاهیلی وئیسلام

بەراستی زۆر كەس وا تیدەگا و وادەزانی خزمایەتی وبنەماڵە هەیە لە نیوان عومەری كوری خطاب و ضیرار ی كوری خطاب ، بەوەی یەكیكیان برای ئەوی تریانە ، بەلام راستیەكەی نە برای یەكن و نە خزمایەتیش لە نیوانیان هەیە ، بەلكو ئەوەی جیگای گومانە ناوی باوكیان لە یەك دەچی

ئەم ئالۆزیە وای لە ئافرەتیكی دەوسی كرد بە ناوی (أم غیلان ) لە سەردەمی عومەری كوری خطاب ﷺ كەوا بە هەلە دابچی

ئەمەش كاتیك ضیرار كوری خطاب پەنا دەباتە بەر مالی ئەم ئافرەتە لە كاتیك كۆمەلیك لە دوژمنەكانی دەوری لیدەدەن بە مەبەستی كوشتنی ، جا ئەم ئافرەتە هاوار دەكاو بانگی ئافرەتانی میللەتەكەی دەكات بۆ یارمەتی، بەم جۆرە ضیرار بە هۆی ئەم ئافرەتە رزگاری دەبیت

پاشان ئەم ئافرەتە لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەر ﷺ دیتە لای و وادەزانیت برای ضیرارە، بۆیە چیرۆكەكەی بۆ دەگیریتەوە بەلكوپاداشتیكی بداتی ،ئیمامی عومەر پیی‌دەلیت

من برای ئەو نیم تەنها لە ئیسلام نەبیت ، ئیستاكەش ئەم پیاوە لە جیهادە و چاكەی تۆشم لەسەر ئەم زانی ، پاشان هەندیك مالی پیبەخشی

بنەمالەی ضیرار كوری خطاب كوری مرداس كوری كثیر كوری عەمر كوری حبیب كوری عەمر كوری شیبان كوری محارب كوری فیهری قورەیشیە

باوكی خطاب كوری مرداس لە سەردەمی خۆی سەرۆكی نەوەی فیهر بوو ، یاسای چارەكی لە نەوەی خۆی وەرگرت ، ئەمەش بەلگە بوو لەسەر گەورەیی و ریزی باوكی

ضیرار لە بارودۆخیکی وا پەروەردە بوو کـەوا شانازی دەکـــرا بە بنەمالــــەو دەولەمـەندی و هـەولی دەسـەلاتداری دەدرا ، زۆربـەی رۆژانـی بریتـی بـوو لـە جـەنگ وشـەروخوین ، جـا لەسـەر سـوارچاکی پەروەردە بوو هیچ یەکیك لە نەوەکانی قورەیش شانی لە شانیdنەدەدا

هەر لەکاتی لاویەوە بوو بە سەرۆکی نەتەوەکەی لە جەنگی فیجار ، هەروەها بە هۆی شیعرەکانی دل ودەروونـی سوپاکەی جۆش دەدا و هانی دەدان بۆ ئەوەی زیاتر پەلاماری دوژمنەکانیان بدەن ، لە بەر ئەوە بە ضیرار کوری خطاب دەگووترا

## سوار چاکێ وشاعیری قورەیش

ضیرار لە یەکەم جەنگی قورەیش لەگەل ئیسلام واتـە لـە جـەنگی بەدر بەشداری کـردو تیایدا جـەنگیکی زۆر توونـدی لەگـەل کـردن ، لـە هەموو سوارچاکەکانی قورەیش دیارترو هەلکەوتووتر بوو ، هەروەها لـە جەنگی ئوحودیش هەر بەمجۆرە بەشداری کرد ، هەروەك دەگیرنەوە لە جەنگی ئوحود عومەری کوری خەتاب بەرەو رووی ضیرار دیت ، ضـیرار بە پانایی رمەکە لە ئیمامی عومەری دەدا و پیی دەگووت :

( انج يا ابن الخطاب لا أقتلك )

واتە : رزگار بە ئەی کوری خطاب ناتکوژم .

لە بەر ئەوەی ئیمامی عومەر پلـەو پایەیـەکی تایبـەتی هـەبوو لـە دەروونی ضیرار و خۆشی دەویست .

ئیمامی عومـەر ئـەم هەلویستـەی هـەر لـە پیش چاو بـوو پـاش موسلمان بوونی ضیراریش هەر لە یادی نەچوو، ئەمەش بەلگەیە لەسـەر خۆشەویستی بۆ ئیمامی عومەر لەگەل ئـەوەی لـە بیروبـاوەریش جیـاواز بوون ،ئەگەر ئەم خۆشەویستیەش نەبوایـە لەوانەیـە ئیمـامی عومـەریش هەروەك موسلمانانی تر شەهید بکرابایە.

رۆژیکیان تیرەی ئەوس وخەزرەج لەناو یەك نـاکۆك دەبـن لەسـەر ئەوەی یەکیکیان لەوی تریان ئازاتر بووینە ،ضیرار ئـەو کاتـە موسـلمان بووبـوو ، ئـەویش بـە لایـاندا تیپـەری لـە کـاتیکدا بەلگـەیان بۆ یـــەکتر دەهینایەوە ، جا پیکیان گووت:

ئەمـە ضـیرارە و ئـەم جەنگـەی بینیـوە . جـا پرسـیاریان لیکـرد وئەویش گووتی: ( لاأدري من أوسكم ومن خزرجكم ولكنـي زوجـت منـكم يوم أحد احد عشر رجلا من الحور العين ).

واتە: من نازانم کامتان ئەوسیەکان بوون وکامتان خەزرەجیەکان بوون بەلام من لەجەنگیئوحود یازدە پیاوم لە پەری بەهەشت مارەکرد.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەمانە شەهید کراون وچوینە بەهەشت وگەیشتینە بە پەریەکانی بەهەشت هەروەك پەروەردگار بەلینی پیداون .

هەروەها ضیرار یەکیك بوو لەوانەی رۆژی خەندەقیش بەشداری کرد ، یەکیك بوو لەوانەی هەولی دەدا لە خەندەق بپەریتەوە و سەرۆکی پۆلیك لە پۆلەکانی قورەیش بوو لەم رۆژگارەدا ، جارجارە هیرشی دەکردە سەر کۆمەلەکانی موسلمانان ، هەلدەستا بە جولانەوەی سەربازی ئەمەش بەلگە بوو لە سەر شارەزایی وزیرەکی لەم مەیدانەدا

ئینجا بە هەر جۆریك بیت ضیرار کوری خطاب یەکیك بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی ئیسلام و خراپی وناپاکی کەمتر نەبوو لە ئەبو جەهل و ئومەییەی کوری خەلەف و هاوشیوەکانیان لە سەرانی کوفرو تاریکی ، ئەگەر ئیسلام گوناهەکانی پیشووی رەش نەکردبایەوە هەروەك پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت :

ئەوا لیپرسینەوەی ضیرار لایخوای گەورە زۆرگران دەبوو .

پاش ئەوەی پیغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو مەککە وفەتحی کرد بەرگری ضیرار رووخاو بینی رزگار بوونی نیە لە ئیسلام ، لیرەدا شوینیکی نویی لە دەروونی خۆی لە ژیر ئالایەکی نوی کردەوە ، ئەم ئالایەش ئالای هەق وهیدایەت بوو ، هەرکە لیبوردەیی ئیسلام و بەرزی رەوشتی پیغەمبەری خوای ﷺ بە چاوی خۆی بینی ، ئەوەبوو بە گویی خۆی ووشەی لیبوردنی بیست لە دەمی پیرۆزی پیغەمبەری خوا ﷺ کەوا فەرمووی

﴿ اذهبوا فأنتم الطلقاء ﴾ ...

واتە: برۆن ئیوەئازادن

هەروەها یەکتاپەرستی خواو پیغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ وپەیامەکەی بە چاوی خۆی بینی

پاشان گویی لە قسەکانی سەعدی کوری عوبادە بوو کە دەیگووت:

( الیوم یوم الملحمة ، الیوم تسبی الکعبة ، الیوم یذل الله قریشا )

واتە: ( ئەمرۆ رۆژی تۆمارکردنی داستانە ، ئیمرۆ کەعبە دەکەویتە بەردەست و ئیمرۆ خودا قورەیش ریسوا دەکا )

جا ضیرار به دلشکاوی وعاجزیـەوە هاتـە لای پیغەمبـەری خـوا ﷺ و سکاڵای حالی خۆی بۆ کرد و پیی گووت :

سەعد ئاوا دەلی

| | |
|---|---|
| یـا نبی الهـدی الیك لجـا | حـی قریش وانت خیرلجـاء |
| حین ضاقت علیهم سعةالارض | وعـاداهـم الـه السـماء |
| والتقت حلقتا البطان علیالقوم | ونـودوا بالصیلم الصـلعاء |
| ان سعـدا یرید قاصـمة الظـهر | بأهل (الحجون)و (البطـحاء) |

جا پیغەمبەری خوا ﷺ وەك نموونەی سـەرکردەیەکی بـە بـەزەیی دلنەوایی ضیرار ی کرد و پیی فەرموو:

﴿ **الیوم یوم المرحمة ، الیوم تکسی الکعبة ، الیوم یعز الله قریشا** ﴾ .

واتە: ﴿ ئیمرۆ رۆژی بەزەیی یـە ، ئیمـرۆ کەعبـە بـەرگ دەکـری ، و ئیمرۆ خودا قورەیش سەرفراز دەکات ﴾.

پاشان فەرمانی کرد ئالاکە لە دەست سەعد بسـینریتەوە و بدریتـە کورەکەی قەیس ، جا بەم شـیوەیە ضـیرار هیـور بـۆوە و دل ودەروونـی نەرم ونیان بۆوە

پاش ئەوەی پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە پەروەردگارو وەفـاتی کرد ، هەندیك تیرەو هۆز لە ئیسلام هەلگەرانەوە ، بـەلام ضیرار رۆژ بـە رۆژ لەسەر موسلمان بوونەکەی چەسپاوترو بروا بە تین تر دەبوو ،یەکیك بوو لەم موجاهیدانەی کە گیانی خۆی بەخشیبوو وە بەراسـتی بـەرگری لە ئیسلام کردو سنورەکانی پاراست .

هەروەها ئـەم یاوەرە بـەریزە زۆر خـالیدی کوری وەلیـدی خـۆش دەویست و هاوکاری دەکرد ، ئەوەبوو خۆی گـەیاندە سوپاکەی خـالیدو لە جەنگی یەمامە بەشداری کـرد و کۆششـیکی زۆری کرد دژی ناهـەق و گومرابووەکان لە موسەیلەمەی درۆزن و شوینکەوتەکانی تـاکوو زالبـوون بە سەر ئەم فیتنەیەدا

پاشـان لەگــەل خــالید رووی لــە عـیراق کـردو بەشـداری هــەموو جەنگەکانی کرد ، بە ناوبانگترینیان جەنگی رزگار کردنی ( الحیرە) بـوو کەوا خالید ئەم کارەی دا دەست ضیرار لە گەمارۆدانی کۆشکی( الغریین) لەبەر ئەوەی ئازایەتی و هەلکەوتوویی لی بینیبوو ، وە گومانی باشـی بـە ضیرار دەبرد

فەرمانی ئەبوبەکری صەدیق ﷺ هات بۆ خالید کەوا هەندیك لە موجاهیدەکان لەگەڵ موسەنناى کوری حاریسەی شەیبانی لە عیراق بە جێ بهێلیت و ،هەندیکیان لە گەڵ خۆی ببات و رووبکاتە شام بۆ فریاکەوتنی سوپای ئیسلامی لە دژی رۆمەکان ،جا ضیرار لەگەڵ خالید دەرچوو بۆ زۆربەی هیرشە سەربازیەکان کەوا زانراوە لە میژووی کۆن ، خالید ﷺ توانی دۆڵ وبیابانەکان ببریت لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بە شیوەیەکی وا خەلك ریگایان پی نەبردبوو ، داستانیك بوو پیویستی بە باسکردن و گیرانەوەیەکی زۆر دەکات ، هەر کەسیکیش دەیەوی بە تەواوی بیزانیت دەتوانیت پەرتووکەکانی میژوو بخوینیتەوە ، بۆ ئەوەی بە تەواوی لە راستیەکان بگات .

ضیرار یەکیك بوو لەوانەی خالید پشتی پی دەبەست لەم کارەگرانەدا ، بەلکو یەکیك بوو لە راویژکارە نزیکەکانی و لیپرسراوە سەربازیەکانی

ضیرار بەشداری جەنگییەرمووکی کرد کەوا ئازایەتی و خۆراگری ئەو یەکیك بوو لە هۆیەکانی سەرکەوتنی خالید لەو جەنگەدا کەوا خوای گەورە بۆی رەوانەکردن لەو رۆژە مەزنەدا

پاشان هەر لەگەڵ خالیدو ئەبو عوبەیدەی کوری جەراح روویان لە دیمەشق کرد و رزگاریان کرد ، پاش فەتحی دیمەشق لەوان جیا بۆوە و لەگەڵ هاشم کوری عوتبەی زوهری رووی لە عیراق کردو چووە ناو سوپای سەعدی کوری ئەبی وەقاص و جەنگی قادسیەی بینی ، لەم جەنگەدا ئالا گەورەکەی فارس بوو بە دەسکەوتی ضیرار ولە جیاتی ئەوە سی هەزار درهەمیان پی بەخشی ،لە کاتیکدا فارسەکان بە ملیۆنیك ودووسەد هەزار نرخاندبوویان .

لە پاش ئەمە فەتحی مەدائینی کۆنی بینی لە لای رۆژئاوای رووباری دیجلە ، کاتیك ضیرار تاقی کیسرای بینی بە دەنگیکی بەرز هاواری لیهەلساو گوتی:

( الله اكبر !! هذا ابيض كسرى هذا ما وعدالله ورسوله ﷺ ) .

واتە : الله اكبر ! ! ئەمە گەنجینەی کیسرایە ، ئەوە ئەو شتەیە کەخواو پیغەمبەرەکەی ﷺ بە لینیان لە سەر دابوو .

پاشان ضیرار له ژێر ئالای هاشمی کوڕی عوتبه جەنگی جەلەولای بینی ، کاتێك هاشم بە سەرکەوتوویی لە جەلەولا گەڕایەوە ، سەعدی کوڕی ئەبی وقاص هەوالی دا کەوا هورمزان سوپایەکی گەورەی لە فارسەکان لە دەشتایی ماسبەزان کۆکردۆتەوە ، ئەوەبوو سەعد نامەی بۆ خەلیفەی بڕواداران عومەری کوڕی خطاب نووسی ، ئیمامی عومەریش بۆی نوسیەوە وگووتی:

پاش سلاوی خوای گەورە ، ضیراری کوڕی خطابی لەگەل لەشکریك بۆ بنێرە ، پێشەنگەکەی هوزەیلی ئەسری وبالەکانی عبداللەی کوڕی وەهەبی راسبی و مضاربی عەجلی لەگەل بێت

بەم شێوە یە ضیرار گەیشتە پلەی سەرکردایەتی کەوا بە راستی شایەنی ئەو بوو .

ئەوەبوو لەگەل سوپاکەی بە رێکەوتن تاکوو گەیشتنە دەشتی ماسبەزان و گەیشت بە فارسەکان ، پیلانیشی ئەوەبوو بە هێرشێکی کتوپڕ بدات بەسەر دوژمنەکانی ، ئەو پیلانەشی لە شمشێری خوا( خالیدی کوڕی وەلید ) ﷺ فێربووبوو .

ئیتر موسلمانەکان پەلەیان کرد لە هێرش بردن و پەلاماریان دان ، ضیرار ڕیزی دوژمنەکانی بڕی وکەوتە لیدانی فارسەکان تاکوو گەیشتە سەرۆکەکەیان و بە دیلی گرت ، جا سوپای فارس ورەیان بەرداو شکستیان خوارد ، سەربازەکانی دوژمن لەسەر چیاکانی دەوروبەر بلاوەیان کرد، پاشان ضیرار داوای خۆبەدەستەوەدانی لیکردن و پەیمانیشی دانی کەوا دەستیان لێنەدا ، جا ئەوانیش بەپیری بانگەوازەکەی هاتن وملکەچ بوون .

ضیرار لە ماسبەزان جێنشین بوو تاکوو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بردیەوە بۆ کوفە وضیراریش فەرمانەکەی بەجێ گەیاند .

پاش ئەو هەموو داستان وجیهادو خەباتە کە دەگەڕێتەوە بۆ کوفە هیچ شتێك دەربارەی کارەکانی نازانرێت ، هەروەها چەند ریوایەتێکی ئالۆزیش هەیە دەربارەی سالی مردنی ، خوا لێی رازی بێت ولێی خۆش بێت ، ئەوەی لە راستی نزیکە سالی مردنی دەگەڕێتەوە بۆ حەفدەی کۆچی

**رەحمەتی خوا لە سوار چاك وقارەمان وسەرۆکی بێ وێنە ضیرار کوڕی خطاب فیهری قورەیشی بێت**

# (١٠٧)

## عوتبەی کوری غەزوان

بەراستی عوتبەی کوری غەزوان
شوێنی خۆی لە ئیستا هەدا هەیە
عومەری کوری خطابە ﷺ

# ﴿١٠٧﴾
# عوتبەی کوری غەزوان
## بە راستی عوتبەی کوری غەزوان شوینی خۆی لە ئیسلامدا هەیە

عومەری کوری خطاب ﷺ

ئەمیری برواداران عومەری کوری خەتاب ﷺ پاش نویـژی عیشـا نیازی وابوو بروات بۆ سەر پیخەفەکەی بۆ ئەوەی تۆزیـك خـەو لـەچاوی بکەویت بە هۆی ئەو ماندوبونەی چیشتبووی لە ئەنجامی سورانەوەی بە ناو شاردا بۆ هینانەوەی هیمنی وئاسایش .

بەلام خەو زرابوو لەچاوەکانی خەلیفەی پیغەمبەری خوا ﷺ ، لەبەر ئەوەی پۆستەی بە دەست گەیشتبوو کەوا سوپا تیکشـکاوەکەی فـارس بەرامبەر موسلمانان هەر کـاتیك نزیـك دەبـۆوە لـە شـکانی یـەکجارەکی یارمـەتی بـۆ دەهـات لەملاولـەولا ، جـا هـیزی خـۆی پیکدەهـێنـاو خـۆی ئامادە دەکرد بۆ جەنگ .

پییان گووت:

شاری ئوبولـە لـە دەوروبـەری بەسرا بـە گرنگـترین سـەرچاوەکان دادەنریت کەوا یارمەتی سوپا تیکشکاوەکەی فارس دەدات بە مـال ویـە پیاو (جەنگاوەر ) .

جا خەلیفەی موسلمانان بریاری دا سوپایەك رەوانبکـات بـۆ فـەتح کردنی ئوبولە ، تاکوو ریگای یارمەتی لە سـوپای فـارس بـبریت ، بـەلام کەمی موجاهیدان گرفتیکی گەورە بوو لەبەردەم ئەم بریارە.

لە بەر ئەوەی گەنج وپیرەکانی موسلمانان زۆربەیان دەرچووبـوون بۆ شوینەکانی تر بۆ جەنگ کردن لە پیناویخوا ، بۆیـە ژمارەیـەکی زۆر کەمی موجاهیدانی لامابوو لە شاردا

جا پەنای برد بۆ ئەو پیلانەی کە هەموو کـات پشـتی پیدەبەسـت وپیی ناسرابوو

ئەمەش بریتـی بـوو لەقەرەبووکردنـەوەی سـەربازەکانی بـە هـیزی فەرماندە

جا جۆرکی پیاوەکانی یەك بە یەك لەبەردەمی خۆی هەلرشت ویەك یەك تیرەکانی تاقی دەکردنەوە ، ئەوەندەی نـەبرد هـاواری لی هەلسا و گووتی:

بینیمەوە   بەلی بینیمەوە

پاشان رۆیشت بۆ لای پیخەفەکەی و گووتی:

موجاهیدیك بەدرو ئوحودو خەندەق و هاوچەشنەکانی بینیوە...

هەروەها یەمامەشی بینیوە

جا تـیریکی هەلـەی نـەکردووە ، بـەلکو لـە شـوینی مەبەسـتی داوە...

پاشان هەردوو هیجرەتی بینیوە ( حەبەشە ومەدینـە)حەفتـەمی ئەو حەفتانە بوو کە لەسەر رووی زەوی موسلمان بوو

کاتیك بەیانی لی بۆوە گووتی:

عوتبەی کوری غەزوانم بۆ بانگ بکەن .

ئالایەك وسی سەدو سیزدە و هەندیك موجاهیدی بۆ ئامادە کرا و بەلینی پیدرا کە ئەگەر لە دوای ئەو موجاهید بە دەست کـەوت بـۆی رەوانە بکریت

کاتیك ئەم سوپا بچووکە نزیك بـوو بەری بکـەویت ئیمامی عومـەر وەستا بۆ ئـەوەی مالئـاوایی لـە سـەرکردەکەی عوتبـەی کـوری غـەزوان بکات وئامۆژگاری بکات جا پیی گووت:

ئەی عوتبـە مـن بـەرەو خـاکی ئوبولـە رەوانـەت دەکـەم ، کـەوا قەلایەکە لە قەلاکانی دوژمنان ، جا تکاکارم لە خـودا یارمـەتیت لەسـەر بدات .

ئەگەر گەیشتیە لایان بانگی میللەتەکە بکە بـۆ لای خـودا ، هـەر یەکیك بە پیرتەوە هات لیی قەبول بکـە ، هـەر کەسـیك سـەرپیچی کـرد جزیەی لی وەرگرە بە ناچاری ، ئەگەرنا شمشیر لەسەر ملیان دابنـی بـە بی ئەوەی روحمیان پی بکەیت .

ئەی عوتبە لە خوا بترسە لەسەر ئەوەی پیت دەسپیردریت .

ئاگـادار بـە لـەوەی دەروونـت راتبکیشـیت بـۆ لـووت بـەرزی وئاخیرەتت لی تیك بدات ( لەیادت بباتەوە )

بزانە بەراستی تۆ یاوەری پیغەمبەری خـوات ﷺ کـردووە ، پـاش ریسوایی خوا سەرفرازی کردوویت و پاش بی هیزی بـە هـیزی کردوویت

تاكوو بووى بە ئەميريكى دەسەلا تدارو فەرماندەيەكى گويرايەل ، دەليى و گويرايەليت دەكريت ،فەرمان دەكەيت و گويرايەلى فەرمانتن ، جائەى لەبەر ئەو نيعمەتەى لە خشتەت نەباو فيلت لى نەكا و راتنەكيشيت بۆ دۆزەخ ، خوا تۆو منى لى بپاريزيت.

۞ ۞ ۞

عوتبەى كورى غەزوان لەگەل موجاهيدەكانى و خيزانەكەى و پينج ئافرەتى تر خيزانى موجاهيدان وخوشكەكانيان بەريكەوتن تاكوو لە شوينيكى ووشكە گيا لە نزيك شارى ئوبولەدابەزين.

شايەنى باسە هيچ خواردنيكيان لەلا نەبوو بۆ ئەوەى بيخۆن

كاتيك برسيەتى زۆرى بۆ هينان ، عوتبە بە چەند پياويكى خۆى گووت:

بگەرين لەم شوينە بە دواى شتيك بۆ ئەوەى بيخۆين .

جا هەلسان گەران بە دواى شتيك بۆ ئەوەى برسيەتيان پى بشكينن ، جا لە مەسەلەى خواردن چيرۆكيكيان هەيە كەوا يەكيك لە خۆيان بەم شيوەيە دەيگيريتەوە و دەليت :

كاتيك ئيمە دەگەراين بەدواى شتيك بۆ ئەوەى بيخۆين ، چوينە ناو دارستانيكى چر دوو زەمبيلمان بينيەوە يەكيكيان خورماى تيابوو ، ئەوى تريشيان تۆى سپى گچكە داپۆشرابوو بە تويكلى زەرد ، جالەگەل خۆمان هەلمانگرت تاكوو بردمان بۆ سەربازگە ، يەكيكمان تەماشاى زەمبيلەكەى كرد كەوا تۆى لەناو بوو و گووتى:

ئەمە ژەهرە دوژمن بۆى داناوين ، ليى نزيك مەكەون

بە ناچارى ملمان لە خورمايەكە ناو ليمان خوارد .

هەروەها ولاخيكمان لەلابوو رەسەنايەتى خۆى لە دەست دابوو ، زەمبيلە تۆيەكەمان لە پيش دانا بۆ ئەوەى ليى بخوات ، سويند بەخوا دەمانويست سەرى ببرين پيش ئەوەى بمريت بۆ ئەوەى سوود لە گۆشتەكەى ببينين .

هاورييەكەمان گووتى:

وازى لى بهينن ، ليبگەرين من ئەمشەو ئيشكى ليدەگرم ئەگەر زانيم دەمريت سەرى دەبرم

جا كە بەيانى داهات بينيمان ئەسپەكە ساغ وسەلامەتە و هيچ زيانى پێنەكەوتووە ، خوشكەكەم پێی گووتم:

ئەی برام من گوێم لە باوكم بووە دەیگووت :

ژەهر زيانى نابێت ئەگەر لەسەر ئاگر دابنرێت و سوور بكرێتەوە

پاشان هەندێك تۆی لەناو مەنجەلێك داناو ئاگری لەژێری كردەوە

پاشان ئەوەندەی نەبرد گووتی

وەرن تەماشا بكەن چۆن رەنگی سوور هەڵگەرا ، پاشان پەڵكەكەی شەقی دەبردو تۆیە سپیەكەی لێ دەهاتە دەرەوە

جاخستمانە ناو قسعەیەكی گەورە ، عوتبە پێی گووتین:

ناوی خوای لەسەر بهێنن وبیخۆن ، جا خواردمان ، تاكوو بلێیت بەتام بوو .

پاشان زانیمان ئەمە ناوی چەلتووكە ، واتە برنجە .

❁ ❁ ❁

ئوبولە ئەو شارەی عوتبەی كوری غەزوان بە سوپا گچكەكەی رووی تێكرد شارێكی پۆلا یێن بوو ، كەوتبووە قەراغی رووباری دیجلە ، فارسەكان كردبوویان بە كۆگای چەكەكانیان ، هەروەها بورجی وایان بۆ دامەزراندبوو ببوو بە شوێنی تیروانین وچاودێری كردنی دوژمنەكانیان

بەلام ئەمە وای نەكرد عوتبە هێرشی بۆ نەكات ، لەگەل ئەوەی ژمارەی پیاوەكانی كەم بوو و چەكەكانیان سادە بوو ...

پیاوەكانیان بریتی بوون لە سی سەدوسێزدە و هەندێك و ژمارەیەكی كەم لە ئافرەت .

هەروەهابێجگە لە چەكی شمشێر و رمیش هیچی تریان لەلا نەمابوو ، جالەم حالەتەدا مەحال بوو دەبوایە زیرەكی خۆی بەكاربهێنێت

عوتبە چەند ئالایەكی ئامادە كرد بۆ ئافرەتەكان بەهۆی سەری رمەكانیان بەرزیان كردبۆوە

فەرمانی پێكردن لە دواوەی سوپا برۆن وپێی گووتن :

ئەگەر ئێمە لەشارەكە نزیك بووینەوە تۆزوخۆڵ لە دواوەی ئێمە بكەن تاكوو ئاسمان پردەكەن

کاتیك گەیشتنە نزیك ئوبولە سەربازەکانی فارس بۆیان دەرچوون ، بینیان بۆیان دین ، هەروەها تەماشای ئەم ئالایانەشیان کرد لە دواوەیان دەشەکایەوە ، لەگەل ئەو تۆزو خۆلەی دواوەیان کەوا ئاسمانی پرکردبوو .

هەندیکیان بە هەندیکیان گووت:

ئەمانە پیشەنگی سەربازەکانن ، لە دواوەیان سوپایەکی گەورە هەیە تۆزیان کردووە ، ئیمە کەمین

پاشان ترس بەرۆکی گرتن ودلیان پر بوو لە ترس ، هەلسان ئەو شتانەی بەنرخ بوو وەکیشیان کەم بوو هەلیان گرتوو،پیشبرکییان دەکرد بۆسواربوونی ئەو کەشتیانەی لەنگەریان گرتبوو لە لیواری دیجلە وپشتیان هەلکرد .

عوتبە چووەناو ئوبولە بەبی ئەوەی یەك پیاوی لەدەست بدا پاشان ئەو شاروگوندانەی دەرەوەشی فەتح کرد.

لەم شوینانە دەسکەوتیکی ئەوەندەیان بەدەست کەوت کە ناتوانریت سنووری بۆ دابنریت وبژمیردریت

تاکو یەکیك لە پیاوەکانیعوتبە دەگەریتەوە مەدینە ،جاخەلك پرسیاری لی دەکەن:

موسلمانان لە ئوبولە چۆنن ؟

ئەویش گووتی :

لەچی پرسیار دەکەن ؟!

سویند بەخوا جیمهیشتوون لە کاتیکدا زیرو زیویان دەخستە بەر تەرازوو وە دەیانکیشا

جا خەلك خۆیان ئامادە دەکرد و دەرۆیشتن بۆ ئوبولە

لیرەدا عوتبەی کوری غەزوان بینی جینشین بوونی سەربازەکانی لەم شارە فەتح کراوە وا نزیکە دەیانبات بۆ نەرم ونیانی ژیان ، رەوشتی ئەم وولاتە هەلدەگرن ، هیزو ورە بەردەدەن بۆ بەردەوام بوون لەسەر جەنگ ، جابۆ ئیمامی عومەری ﷺ نووسی ریگای بدات بۆ دروست کردنی شاری بەصرە ، ئەوەبوو ئەم شوینەی بۆ باس کرد کەوا هەلیبژاردبوو ، ئەویش ریگای پیدا.

جا عوتبە نەخشەی شاری نویی کیشا

یەکەم جار مزگەوتیکی گەورەی لی دروست کرد

جیگای سەرسورمان نیە کەوا لە پاش دروستکردنی ئەم مزگەوتە خۆی و هاوریکانی دەرچوون لە پیناوی خوا
بە هۆی کۆبونەوەیان لەم مزگەوتە خۆی و هاوریکانیسەرکەوتن بەسەر دوژمنانی خوا
پاشان سەربازەکانی پیشبرکییان دەکرد لەسەر برینی شارو وولات و دروستکردنی مال و خانووبەرە
بەلام عوتبە مالیکی بۆخۆی پیکەوە نەنا ، بەلکو هەلسا خیوەتیکی دروست کردو تییدا نیشتەجی بوو
لەبەر ئەوەی لە دەروونی خۆی بریاریکی تری دابوو
جا عوتبە بینی دونیا بە شیوەیەکی بی سنوور رووی لە موسلمانان کردووە لە شاری بەصرە ، بە جۆریك مرۆڤ سەری لە خۆی سوردەما
لە کاتیکدا پیاوەکانی پیش ماوەیەك نەیاندەزانی خواردنی برنج چیەو تامی چۆنە ؟ بەلام پاشان تامی خواردنی فارسەکانیان کرد لە خواردنی کولیچەو خواردنی بە رۆن و شیرینی بە هەنگوین و هیتر
جا بەهۆی کەوتنی بەسەر دونیاوە لە ئایینەکەی خۆی ترسا و ئاگاداری ئایینی خۆی بوو بە سەر دونیا
جاخەلکی لەمزگەوتی کوفە کۆکردەوەو وتاری بۆدان و پییگووتن:
ئەی خەلکینە وا نزیکە دونیا کۆتاییپی بیت وئیوە بگوازرینەوە بۆ جیگایەکی بیّ کۆتایی ، جاخۆتانی بۆ ئامادە بکەن بە کردەوە چاکەکانتان ، بە چاوی خۆم بینیم کاتیك حەوتەمینی ئەو حەوتانە بووم لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ ، هیچ خواردنیکمان نەبوو بیجگە لە گەلای دار نەبیت تاکوو وای لیهات هەموو لیوەکانمان بتەقیت .
هەتا رۆژیکیان جلیکمان لەسەر زەوی هەلگرتەوە لە نیوان من وسەعدی کوری ئەبی وەقاص کردمان بە دوو لەتەوەو من لەتیکم لەبەر کرد و سەعدیش لەتەکەی تر .
ئیستاش وا دەبینم ئەمرۆ کەس نەمایە کە نەبووبی بە ئەمیر لەسەر شاریك لە شارەکان .
من خۆم دەپاریزم بەم خودایە لە دەروونی خۆم کەوا گەورە ببم و گچکە ببم بەرامبەر بەو خوایە
پاشان پیاویکی لە شوینی خۆی دانا و مالئاوایی لیکردن و رۆیشتەوە بۆ مەدینە

کاتیك گەیشتەوە لای فاروق داوای لیکرد لەسەر ویلایەت لاییبات ، ئەوەبوو هەولی زۆری دا بەلام خەلیفە لاینەبرد وفەرمانی پیدا بگەریتەوە سەر بەصرا ، ئەویش بە ناچاری ملکەچی فەرمانی بوو ، بە نادلیەوە سواری ووشترەکەی بوو دەیگووت

اللهم لاتردنی الیها

اللهم لاتردنی الیها

واتە: خودایە بۆ ئەم شوینە نەمگیریتەوە

خودایە بۆ ئەم شوینە نەمگیریتەوە

خوای گەورەش دوعایەکەی قەبول کرد وهیشتا نەگەیشتبووە شار لەسەر ووشترەکەی کەوتە خوارەوە و گیانی پاکی بە پەروەردگار سپارد

## رەزای خودا لە یاوەری بەریزی پیغەمبەری خوا ﷺ و جیگای متمانەی خەلیفەی پیغەمبەری خوا ﷺ عوتبەی کوری غەزوان ،خوای گەورە لیی رازی بیت .

# (١٠٨)

## عبیدالله کوری عەبباس

ئای لەبەرزەمەنایەتی عوبەیدوڵڵا
لە چ هێلکەیەک دەرچووە ؟؟ لە
چ هێلانەیەک پەروەردە بووە ؟؟

موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ﷺ

# ﴿١٠٨﴾

## عبيدالله كورى عەباس

### ئایا لەبەر ڕەسەنایەتی عوبەیدوڵلا ،لەچ هێلکەیەک دەرچووەو ؟ لە چ هێلانەیەک پەروەردە بووە ؟؟

موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان

ئەگەر میژووی ئیسلام باسی ( عبداللـەی کـوری عبـاس ) بکـات وچەند نازناویکی بە سەرەوە نابی بە هۆی زانستە زۆرەکانی و بەرزی رەوشتی و پاکی دەروون و نازناوی ترجمان القـران بـە تایبـەتی ئـەم نازناوەی دوایی زیاتر بلاوە وبە سەریدا زالە

هەروەها میژوو باسی برایەکەشی عبیداللەدەکات و بە هۆی ئەو سەخاوەتیە بی وینەیەی هەیبووە ، بە راستی شتی واش لـە میـژووی مرۆڤایەتی دروست نابیت ، ئەمانەش هەموو تۆمارکراون لە ژیاننامەی ئەم یاوەرە خۆشەویستە.

لەگەل ئەوەی کـە بەخشـندە بـوو ودەسـتەکانی کراوەبـوو بـۆ بەخشین ، خاوەنی رەوشتیکی بەرزو روویەکی نەرم و سـۆز وبـەزەیی یەکی بی ئەندازە بوو

هەروەها لەبەر ئـەو زانیاریـە زۆر ونیمانـە بیوینەیـە وملکـەچی یەی کە هەیبوو، گەیشتبووە سنووری برواداره زاهیدو بیگوناهەکان.

ئینجا بالیرەدا ئەم سیفەتە بـەرزەش لـەیاد نەکـەین دەربـارەی ئەم یاوەرە بەریزە وزاناناوداره، پیاویك بوو هەر کاتیك گرفتیگ رووی دەدا چارەسەری بۆ دانەدەنرا ئەوا دەیاننارده دوای عبیدالله بـەهۆی بیر تیژی وبیرورا پەسندەکانی مەحال بوو چارەسەری بۆ دانەنێ

عبیدالله کوری عباس کوری عبدالمطلب کوره مـامی پیغەمبـەری خوا ﷺ لە هۆزی قورەیشی نەوەی هاشم بوو .

نازناوی باوکی محمدبوو ، دایکی لبابە الکبری کچی حـرب کـوری مزنی هیلالی بوو کە پلکی خالیدی کوری وەلید بوو . دوو سـال پیـش کۆچکردن لە دایك بووە ، لە عبداللەی برای کەوا پیغەمبەری خـوا ﷺ بە تەرجومانی قورئان ناوی دەبرد سالیك بچووکترە

پیغەمبەری خوای ﷺ بینیوەو فەرموودەی لێ وەرگرتووە
عبداللە پێش فەتحی مەککە لەگەڵ باوکی ( عباس کوری عبدالمطلب) موسلمان بووە وهەر لەویش جینشین بووە ، عبیداللە زۆر بەپەرۆش بوو بۆدیداری کورە مامی واتە پیغەمبەری خوا ﷺ
هەموو کات حەزی دەکرد گوێبیستی هەواڵ بیت لە باوکی عەبباس دەربارەی کورە مامی ، زۆر کەیف خۆش دەبوو بە سەرکەوتنەکانی ، دلی گەش دەبۆوە بە سەرکەوتنی بانگەکەی .
ئیمامی عەبباس ﷺ زۆر جاران بەرەنگاری گاڵتەوگاڵتەجاری قورەیش دەبۆوە کە ناتوانریت باسی لیوە بکریت ، لەگەڵ ئەمەشدا بەرگەی دەگرت ودەگەرایەوە ماڵەوە ، ئەوسا دلی دادەمرکایەوە
بەمجۆرە عبیداللە ئەمانەی لە باوکی دەبینی ولە کاتیکدا گەنجیکی تەرو ناسك بوو ویژدانی بە جۆش دەهات و هەست ونەستی ئاگری دەگرت و دەروونی جۆشی دەدا و هیوای دەخواست موجاهیدیك بیت و لە گەڵ پیغەمبەری خوا ﷺ جیهاد بکات .
پاشان داوای لە باوکی دەکرد بچن بۆ مەدینە بۆ یاوەریتی پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلام عەبباسی باوکی رایدەگرت و دلی هێ من دەکردەوە و لەخوین گەرمی وتووندیەکەی کەم دەکردەوە
کاتیك فەتحی مەککە تەواو بوو خەڵك پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئایینی خودا و خوای گەورەش ئالای یەکتاپەرستی بەخشیە دورگەی عەرەبی ، لەم کاتەدا عبیداللە هیشتا هەر لە تەمەنی میردمنداڵی دابوو ، نەگەیشتبووە تەمەنی خۆناسین .
خەلافەتی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان ﷺ تیپەری ، ئا لیرەدا میژوو بی دەنگە بە تەواوی لەو قۆناغانەی کەوا ژیانی عبیداللە پییدا تیپەریوە
کاتیك خەلافەتی ئەمیری بڕواداران عەلی کوری ئەبو طالب ﷺ هاتە پیشەوە کاروباری یەمەنی دا دەست و فەرمانی پیکرد ئەمیرایەتی حاجیەکان بکات ، لە سالی سی وشەشی کۆچی وسی وحەفتی کۆچی حەجی بە خەڵك کرد
هەروەها میژوو بۆمان باس دەکات موعاویەی کوری ئەبو سوفیان لە سالی چلی کۆچی ( بوسر کوری ئەبی ئەرطأة ) ی عامری رەوانەی سەر یەمەن کرد ، عبیداللە ﷺ لەبەر دروست بوونی ئاژاوەو

خوین رژانی موسلمانان له فەرمانرەوایی هاته خوارەوه ، بوسر بوو به فەرمانرەوایان ، بەلام ئیمامی عەلی ﷺ حارسەی کوری قودامەی سەعدی رەوانه کرد بۆ گیرانەوەی ویلایەت ، بوسر هەلات و عبیداللـه گەرایەوه سەر فەرمانرەوایی یەمەن ، تاکوو شەهید کردنی ئیمامی عەلی ﷺ بە دەستی ناپاکان وستەمکاران وگوناهباران ( واته خەواریجەکان ) عبیدالله هەر لەسەر ویلایەتی یەمەن مایەوه

پیغەمبەری خوا ﷺ عبداللـه وعبیداللـه هەردوو کوره مامی ( عەبباس ) لەیەك ریز دایان دەنی و پاشان پییان دەفەرمویت :

**﴿ من سبق الي فله كذاوكذا ﴾.**

واته: ﴿ ئەوەی زوتر بگاته لای من ئەمەو ئەمەی دەدەمی ﴾.

هەردووکیان به خیرایی بەرەو رووی دەهاتن و خۆیان به سینگی پیرۆزی دادەداو ئەویش ماچی دەکردن و به سینگی خۆیەوه دەیکوشین

ئەمەش ئەو کاته بوو که مەککەیان جیهیشتبوو وه له مەدینه جیگیر بووبوون

عبیداللـه ﷺ سەبارەت به سەخاوەتیەکەی به نموونەی سەخاوەت دەهینریتەوه ، هەروەها سەلماندمان بۆ ئەم کاره پیرۆزەو رەوشته بەرزه ، هەموو رۆژیك حەیوانیکی سەردەبری ، کاتیك عبداللەی برای ئاگاداری کردەوه لەم کاره ، ئەمجارەیان هەموو رۆژیك دوو حەیوانی سەر دەبری و گۆشتەکەی دابەش دەکرد بەسەر هەژاران و نەداران ، هەموو مەبەستیکیشی ئەم هەژارانه بوو .

هەروەك میژوو بۆمان دەگیریتەوه کاتیك عبداللـه و عبیداللـه رییان دەکەویته شاری مەدینەی پیرۆز به نیازی حەج یان سەفەر خەلکەکه ئەوەنده دلخۆش دەبوون دەتگووت رۆژی جەژنیتیان یاخود له کەژیکی خیرو بەرەکەتن ، له بەر ئەوه ی عبداللـه دلی خەلکەکەی خۆش دەکرد به زانسته زۆرەکەی و عبیداللـەش خواردن ومالی پی دەبەخشین

محمد کوری وەلید (ابوالحجاج الفزاري )دەگیریتەوه ودەلی

عبیدالله کوری عباس دەردەچیت بۆ سەفەریك ، خزمەتکاریکی لەگەل بوو تاکوو له ریگادا مالی ئەعرابیەکیان بینی ، عبیداللـه به خزمەتکارەکەی گووت :

ئەری لابدەین لە ئەم ماڵە و لەلایان بمێنینەوە ؟

ئینجا رۆیشتن تاکوو لیی نزیك بوونەوە ، عبیداللە ﷺ پیاویکی جوان و دەنگ پیاوانە بوو ، کاتیك ئەعرابیەکە ئەوی بینی ریزی لینا و بە خیزانەکەی خۆی گووت

پیاویکی بەریزو شەریف میوانمانە پیویستە لە سەرمان میوانداری بکەین و ریزی لی بنیین ، ئایا خواردنی ئیوارەمان هەیە بۆی ؟؟

خیزانەکەی گووتی :

نەخیر تەنها ئەم بزنە بچوکە نەبیت ، ژیانی منداڵەکەشت لەسەر شیرەکەیەتی

ئەعرابیەکە گووتی

مەحالە ، دەبیت سەری ببرین

خیزانەکەی گووتی:

ئایا منداڵەکەت دەکوژی

گووتی: ئەگەر بشمریت

پاشان چەقۆی هەلگرت و حەیوانەکەی برد و دەیگووت :

یا جارتي لا توقظي البنية ان توقظيها تنتحب عليه
وتنزع الشفرة من يديه

واتە : ئەی خیزانەکەم منداڵەکە لە خەو هەڵمەستینە ، ئەگەر لە خەو هەڵسیت بۆ حەیوانەکە دەگرییت و چەقۆیەکەم لەدەست دەردەهینیت.

پاشان چەقۆی بە ملی حەیوانەکە داهینا و سەری بری و خیزانەکەی خواردنەکەی ئامادە کرد بۆ عبیداللە و خزمەتکارەکەی و خواردنی ئیوارەیان خوارد ، عبیداللە گویی لە هەموو گفتوگۆی ئەعرابی و خیزانەکەی بوو

کاتیك عبیداللە بەیانی کردەوە بە خزمەتکارەکەی گووت:

هیچ شتیکت لە ماڵ پی نیە ؟

خزمەتکارەکە گووتی

بەلی ، پینج سەد دینار لە مەسروف لەلام ماوە

عبيدالله گوتی

بیده بەم ئەعرابیە

خزمەتکارەکەی گوتی

سبحان الله ، ئایا پینج سەد دیناری پی دەبەخشی ؟ ئەم بە راستی حەیوانیکی بۆ تۆسەر بریوە نرخەکەی پینج درهەمە

عبیدالله پیی گووت :

خاکت بەسەر ، سویند بەخوا ئەمە لە ئیمە سەخیترە ، ئیمە بەشیك لە مالی خۆمانی پی دەبەخشین ، بەلام ئەوشتیکی وای پی بەخشین ئیمەی بە گەورەتر دانا لە خۆی و مال ومندالی

۞ ۞ ۞

کاتیك ئەم مەسەلەیە گەیشتە موعاویەی کوری ئەبو سوفیان گووتی

( لله در عبيدالله من أي بيضة خرج ؟ وفي أي عش درج )؟

واتە: ئای لەبەر رەسەنایەتی عبیداللە ! لە چ هیلکەیەك دەرچووەو لە چ هیلانەیەك پەروەردە بووە ؟!

ئەمەش جیگای سەرسورمان نیە کەوا لە بەر سەخاوەتی عبیدالله نازناوی ( تیار الفرات ) ی لی بنین ، واتە شەپۆلی روباری فورات لە زۆر بەخشینی مال

کاتیك حەسەنی کوری عەلی ﷺ لە مافی خەلافەتی خۆی خۆش بوو بۆ موعاویەی کوری ئەبو سوفیان لە پیناوی ئەوەی نەوەك خوینی موسلمانان برژی ، موعاویە مەبلەغیك لە مالی بۆ دیاری کرد و هەموو سالیك پیی دەدا

جاریکیان وا رووی دا سالیك موخەصەصاتی لیبری تاکوو وای لیهات باری زۆر خراپ بوو ، پییان گووت:

ئەگەر بچیتە لای کوری مامت عبیدالله ئەوا هەزار هەزار درهەمت پیدەبەخشی

ئەویش نامەیەکی بۆ نارد لەگەل نیردراویك و تیایدا باسی پەیوەندی نیوان خۆی وموعاویەی کرد لەگەل خراپی باری ، هەروەها پیویستی بە سەد هەزار درهەم هەیە

کاتیك عبیدالله نامەکەی ئیمامی حەسەنی خوینــدەوە فرمیسـك لە چاوەکانی وەکوو کانیاو جۆگەلەی بەست ، چونکە لە هەموو کەس بە سۆزو بەزەیی تر بوو ، سەرەرای سیفەتی سـەخاوەت و بـەریزی ، پاشان گووتی

ئازار بۆتۆ ئەی موعاویە ، چەندجار دەستت لە گوناھ نـاوە لـەو کاتەوە پیت ناوەتە ناو نەرمایی کۆشك وتەلار و حەسـەنیش سـکالای بی دەرامەتی بکات کە خاوەن خیزانیکی زۆرە پاشـان بـە یـەکیك لـە خزمەتکارەکانی خۆی گووت :

هەلسە نیوەی مولکم بۆ حەسەن ببە لە زیرو زیوو جل وبەرگ و چوارپی ، پیی بلین من مالم لەگەل کردووە بە دوو لەت ، ئەگەر بەمە قەناعەت دینی باشە ئەگەرنا بگەریوەو نیوەکەی تریشی بۆ ببە

کاتیك نیردراوەکە نامەی عبیداللـەی بـۆ حەسـەن نـارد حەسـەن گــووتی

( انا لله ، سویند بەخوا من باریکی گرانم لەسەر کورە مامی خۆم داناوە ، لەم بروایەش نەبووم بەم شیوەیە بۆمن بیت ).

بەمجۆرە نیوەی مالەکەی بە سوپاس و منەتەوە وەرگرت

بەلی ئەم نموونەی سەخاوەتە کە هینامانەوە لە کاتیکدا بوو کە خەلك زۆر قیرش و درهەمیان خۆش دەویست ، مال بەخشین زۆر کەم بووبوو ، پەیوەندی خزمایەتی لە نیوان خەلك زۆر کەم بوو

بەراسـتی ئـەم نمونانـەش پـەندو ئامۆژگاریـە بـەلکو کۆمـەلگای ئیسلامی ئەمرۆ پەندو ئامۆژگاری لی وەربگرن.

ئەم باسە کەمەی باسمان لیوە کرد کورتەی ژیانی عبیدالله بـوو لە ( المعافی ابن زکریا ) لە کتابی ( الجلیس والانیس ) وەرگیراوە

۞ ۞ ۞

شایانی باسە عبیدالله هەندیك لـەو مالـەی لـە بـاوکی عبـاس ﷺ بەمیرات بۆمابۆوە ، پاشـان مالەکـەی زیـاتر بـوو بـە هـۆی کاسـبی و بازرگانی

ابن اسحاق دەلیت

عەبباس ﷺ کاتیك لە جەنگی بەدر بە دیل گیرا پیغەمبەری خوا ﷺ پیی فەرموو

خۆت بکرەوە تۆ خاوەن پارەی

عەبباس گووتی مالم نیە

پیغەمبەری خوا ﷺ پیی فەرموو

﴿ کوانی ئەو مالەی لەلای ( أم الفضل ) داتنابوو وگووتت: ئەگەر مردم ئەمە بدەن بە ( الفضل ) و ئەمە بۆ عبدالله و ئەمەش بۆ عبیدالله ﴾... تاکۆتایی فەرموودەکە

کاتیك خودا بەخششی خۆی بەسەر نەوەی عەبباسدا رژاند ، عەبباس بە عبیداللەی کوری گووت کە دەیبینی هەموو رۆژیك مال دەبەخشی

( یا بنی ما لك تغدي ولا تعشي ؟! اذا غديت فعش )

واتە: ئەی کورم بۆچی نانی بەیانی دەدەی ونانی ئیوارە نادەیت ؟! ئەگەر بەیانیت دا ئیوارەش بدە

عبیدالله بە غولامەکەی خۆی گووت :

ئەی کورم بەیانیان سەرببرەو ئیوارانیش سەرببرە

ریوایەتچیەکان وا ریوایەت دەکەن کە( عبداللەی کوری عباس ) داوای لە براکەی عبیدالله کرد بۆ خواردن رۆژی عەرەفە ، ئەویش گووتی:

من بە رۆژووم

عبدالله گووتی: ئیوە بنەمالەی پیغەمبەرن و خەلك پابەندتان دەبن ، پیغەمبەری خوا ﷺ داوای شیری کرد لەم رۆژەو خواردیەوە

عبیدالله وەنەبت بە هۆی بازرگانی کردن و خەلك ریز لیگرتن وازی هینابی لە فیربوونی زانست بەلکو لەم لایەنەشەوە هەموو توانای خۆی بە کار دەهینا ، ئەگەر خەلك بۆ ئەمە لۆمەیان بکردبا دەیگووت:

( ان نشطت فالعلم لذتي ، وان اغتممت فهو سلوتي ) ...

واتە: ئەگەر حەز بە ئیش بکەم زانست خۆراکمە ، وە ئەگەر توشی غەم ببم زانست دلم دەداتەوە

عبيدالله ﷺ له زۆری و پری زانست پییان دەگووت :
( حكيم المعضلات ) و ( تيار الفرات )
عبيدالله رۆژيك لەپشت پيغەمبەری خوا ﷺ سوار ببوو ، پياويك بەرەو رووی هات و پیی گووت
ئەی پيغەمبەری خوا ﷺ دايكم پيرەو بەسالاچووە ، ئەگەر نەيبەم بۆ حەج دەترسم لە خەمان بمريت و ئەگەر بشيبەم ناتوانيت خۆی رابگريت .
ئايا چی بكەم ؟
پيغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پيكرد حەجی لە جياتی بكات.
ئينجا ئەم دوو روداوەی لە عبيدالله دەگيرنەوە شوينيكی تايبەتی بۆ بە جيهينانی ئەحكامەكانی حەج دروست كردووە تاكوو ئەمرۆ خەلكی سوودی لی دەبينن

**خودای گەورە پاداشتی كورە مامی پيغەمبەری خوا ﷺ عبيداللەی كوری عەبباس ﷺ بداتەوە بە هۆی ئەم چاو تيريە و ريزەی لە خەلكی هەژارو نەداری دەنا و خوای گەورە بەهەشتی نەمری پی ببەخشی و دەروونی ئيمەش بەم سيفەتە جوانانەی عبيدالله روناك بكاتەوەو جۆش بدات ، وە ئيمەش لە بەهەشتە فراوانەكەی خۆی مەحروم نەكات و لە هەموو لايەك خۆش ببيت و لە تاوانەكانمان ببوريت**

**ئامين يا رب العالمين**

# ﴾١٠٩﴿
# سەلەمەی کوری قەیسی ئەشجەعی
# رزگارکەری ئەهواز

عومەری فاروق ئەم شەوەی بە ئاگایی بردە سەر بۆ پاسەوانی لە گەرەکەکانی شاری مەدینە بۆ ئەوەی خەلك بە دلنیایی و بە بی ترس چاویان بنینە خەو ...

ئیمامی عومەر ﷺ لە کاتیسورانەوەی لەنیوان خانوو وبازارەکان یەکیك لە یاوەرە بەریزو خاوەن غیرەت و کۆلنەدەرەکانی پیغەمبەری خوا ﷺ بە بیردا هات بۆ ئەوەی بیکات بە سەرۆك و ئالای لەشکری بداتی بچیت بۆ رزگارکردنی ناوچەیەك لە رۆژئاوای ئیران بە ناوی ئەهواز

پاشان ئەوەندەی نەبرد هاواری لی هەلساو گووتی
دۆزیمەوە
بەلی ، انشاءالله دۆزیمەوە

هەر کە رۆژ هەلات و بەیانی داهات داوای سەلەمەی کوری قەیسی ئەشجەعی کردو پیی گووت :

من لەسەر سوپایەکت دادەنیم بەرەو ئەهواز رەوانەت دەکەم ، بە ناوی خوا بەری بکەوە شەر بکە لە پیناوی خوا لە گەل ئەو کەسەی لە فەرمانی خوا دەردەچیت ، ئەگەر گەیشتن بە دوژمنەکانتان لە هاوبەش پەیداکەران ، داوایان لی بکەن بۆ هاتنە ناو ئیسلام ئەگەر موسلمان بوون ، یان مانەوە هەلدەبژیرن لە ولاتی خۆیان و هاوبەشی لە جەنگ لە گەل ئیوە ناکەن لەتەك گاورانی تر ، ئەوا هیچیان لەسەر نیە تەنها زەکات نەبیت ، هەروەها لە دەسکەوتی جەنگیش بەشیان نیە

یاخود جەنگ کردن لە گەلتان هەلدەبژیرن ، ئەوا ئەو کاتە چی بۆ ئیوە هەیە بۆ ئەوانیش هەیە ، چ لەسەر ئیوە هەیە لەسەر ئەوانیش هەیە

ئەگەر ئیسلامیان نەویست داوای باج ( جزیە ) یان لی بکەن ، وازیان لی بهینن ولە دوژمنەکانیان بیان پاریزن ، داوای شتیکیان لی مەکەن لەتواناایان دا نەبیت

ئەگەر باجیان نەدا شەریان لە گەل بکەن ، خوای گەورە سەرکەوتوتان دەکات بە سەریاندا

ئەگەر لە قەلایەك خۆیان حەشاردا پاشان داوایان لیکردن کەوا دینەخوار بۆ فەرمانی خواو پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیان لی قەبول مەکەن ، ئەوان نازانن فەرمانی وخواو پیغەمبەری خوا ﷺ چیە ؟؟!!

ئەگەر داوایان کرد دینە خوار لە پەنای خواو پیغەمبەری خوا ﷺ ، پەنایان مەگرن لە پەنای خواو پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلکو ئیوە لە پەنای خۆتان وەریان بگرن

ئەگەر لە جەنگ سەرکەوتن ستەم وغەدر مەکەن و گەمە بە لاشە مەکەن و مندال مەکوژن

سەلەمە گووتی

گویرایەلم ئەی گەورەی بروادااران

عومەر مالئاواییەکی گەرمی لیکردو دەستی بە توندی لە ناو دەستی نا و لە باوەشی خۆی گرت

سەلەمە توانایەکی گەورەی بۆ ئەم کارە دانابوو کەوا دەکەوتە سەرشانی ئەم وشانی سەربازەکانی.

لەبەر ئەوەی ئەهواز ناوچەیەکی شاخاوی ریگە سەختەو شوینەکانی عاسین ( ئەهواز دەکەویتە نیوان بەسرەو سنوورەکانی فارس ) نەتەوەیەکی تیدا نیشتەجی بوو کە زۆر ئازابوون پییان دەگووترا

**کوردەکان .**

موسلمانان چاریان نەما دەبوایە هەر رزگاری بکەن وبکەویتە ژیر دەستیان بۆ ئەوەی پشتیان قایم بکەن لە پەلامارەکانی فارس بۆ سەر بەسراو قەدەغەیان بکەن بۆ ئەوەی وولاتیان نەکەن بە گۆرەپان و سەربازگەی جەنگاوەرەکانیان ، وە ببنە هۆی تیکدانی ئاسایشی عیراق و وولاتیان بخەنە مەترسی

سەلەمەی کوری قەیسی ئەشجەعی بە خۆو بە لەشکرەکەی بەریکەوت لە پیناوی خودا ، هەر لە ریگادابوون ، کەمیکیان مابوو

بگەنە ئەهواز ، کەوا کەوتنە ململانییەکی سەخت لە گەل سروشتە سەختەکەیان .

ئەم سوپایە تووشی چیا کاکی بە کاکی یەکانی ئەم ناوچەیە و دەشتەزەلکاوە نەخۆشی دارەکانی بوو ، هەروەها ململانیلەگەل مار و دوپشکە ژەهراویەکان کەوا نەیاندەهیشت خەو لە چاویان بکەویت

بەلام گیانی سەلەمەی کوری قەیسی برواداری ناسك ، بالەکانی خۆی هینابوو بەسەر سەربازەکانی ، وای کردبوو ئازاریان لەلا خۆش بیت و کاری ناخۆشیان لا ئاسان بیت

دلی ساریژ دەکردن و تینویتی دەشکاندن بە ئامۆژگاری‌یەکانی‌کەوا دەروونیانی هینابۆوە لەرزە

شەوانی پرکردبوون بە بۆنی عەتری قورئان

بە روناکیەکەی دلی پر کردبوون و مەلەیان دەکرد لە جۆگەکانی بەهەشت و هەموو ماندو بوون وناخۆشیەکی لە یاد بردبوونەوە

سەلەمەی کوری قەیس فەرمانی گەورەی بروادارانی بە جی گەیاند ، هەر کە گەیشتە خەلکی ئەهواز داوای لیکردن بینە ناو ئایینی خوا ، بەلام پشتیان تیکردو قەبولیان نەکرد

داوایان لیکردن باج (جزیە) بدەن رازی نەبوون و فیزیان نواند...

بەمجۆرە هیچ ریگایەك نەما بەرامبەر موسلمانان بیجگە لە بە کارهینانی چەك نەبیت ، موجاهیدان رۆیشتن بۆ جیهادکردن لە پیناوی خوای گەورە ، بە نیازی دەست کەوتنی ئەو خیرو چاکەی لە لایەن خواوە دەیاندریتەوە

جەنگی نیوان ئەم دوو هیزە دەستی پیکرد بە جەنگیکی ترسناك و بە گلپەو دژوار ، هەردوو گروپی شەرکەر قارەمانیەتیەکی بی‌وینەیان نواند کە لەمەو پیش جەنگی وایان بە چاوی خۆیان نەبینی بوو

پاشان هیندەی نەبرد جەنگەکە یەکلا بۆوە بە سەرکەوتنیکی ئاشکرا و گەورە بۆ موجاهیدەکان لە پیناوی بەرز کردنەوەی ووشەی خوا و شکستیکی گەورەش بووە بەشی هاویەش پەیداکەرەکانی دوژمنی خوا

کاتیك جەنگەکە کۆتایی پیهات ، سەلەمەی کوری قەیس دەستی کرد بە دابەشکردنی دەسکەوتەکانی جەنگ بەسەر سەربازەکانی

لەم جەنگەدا ملوانکەیەکی بە نرخیان دۆزیەوە ، سەلەمە حەزی کرد بیکات بە دیاری بۆ گەورەی بڕواداران ، بە موجاهیدەکانی گووت:

ئەم ملوانکەیە ئەگەر دابەش بکریت بەسەرتان هیچ شتیکی واتان بەبەر ناکەویت

ئایا رازی دەبن ئەگەر بە دیاری بۆ گەورەی بڕوادارانی بنیرین ؟

گووتیان : بەلی

ملوانکەکەیان خستە ناو سندوقیکی بچووك و پیاویکی لە نەوەی بەنی ئەشجەع کرد بە نوینەرو پیی گووت :

تۆو سەرکارەکەت دەچن بۆ شاری مەدینە و مزگینی سەرکەوتنش بدەن بە گەورەی بڕواداران ، ئەم ملوانکەیەشی بۆ بکەن بە دیاری

مەسەلەی نیوان ئەم نوینەرە ئەشجەعی‌یەو عومەری کوری خطاب هەوالیکە پەندو ئامۆژگاری لی وەردەگیریت

با ئەم گفتوگۆیەش بۆ خودی ئەم نوینەرە لیگەریین تاکوو ئەم باسەمان بۆ بکات

پیاوە ئەشجەعیەکە دەلیت :

من وسەرکارەکەم بەریکەوتین بەرەوبەسرا،دوو ولاخمان کری بەو پارەیەی سەلەمەی کوری قەیس پیی دابووین، خۆراکمان لی بار کرد.

پاشان ڕوومان کردە لای شاری مەدینە ، کاتیك گەیشتینە شاری مەدینە بە دوای گەورەی بڕواداران گەراین ، بینیمانەوە وەستابوو خواردنی نیوەرۆی موسلمانانی دەدا ، خۆی بە گۆپالەکەی هەلواسیبوو هەروەك شوان دەیکات

لە دەوری قاپەکە دەسورایەوەو بە سەرکارەکەی ( یرفأ )ی دەگوت

ئەی یرفأ گۆشت بدە بەمانە
ئەی یرفأ نان بدە بەمانە
ئەی یرفأ شۆربا بدە بەمانە
کاتیك گەیشتمە لای گووتی

دانیشە ، لەهەموو خەڵك نزیکتر لـەلای دانیشـتم و خواردنـی بـۆ هینام وخواردم .

کاتیك خەڵك لەخواردن دەستیان کیشایەوە گووتی :

ئەی یرفأ قاپـەکان هـەلگرە و پاشـان ڕۆیشـت ومنیـش بـەدوای کەوتم

کاتیك گەیشتە ماڵەوە داوای چوونــە ژورەوەم لیکـرد و ئـەویش ریگای دام ، خۆی لەسەر بەرەیەك دانیشت و سینگی دابە دوو بالیفی پیستی پرلۆکە ، یەکیکیانی بۆ هاویشتم ولەسەری دانیشتم

لـە پشـتی پەردەیـەك هـەبوو، ئـاوری دایـەوە بـۆلای پەردەکـەو گووتی ئەی ( ( أم کلثوم ) ) خواردنمان بۆ بهینە

لە دلی خۆمدا گووتم دەبی خواردنی گەورەی بڕواداران چی بیـت کەوا بۆ خۆی تایبەت بیت ؟!!

نانیکی بەرۆن هەندیك خویی نەکوتراوی لەسەر بوو ، دایە دەست گەورەی بڕواداران

ئاوری لە من دایەوەو گووتی: بخۆ .

گویرایەلیم کرد و کەمیکم لی خوارد

خۆیشی خواردی ، کەسـم نـەبینی ئـەم نانـە وەك ئـەو بـە تـام بخوات...

پاشان گووتی

خواردنـەوەمان بـدەری ، جـامیك خواردنـەوەیان بـۆ هینــا لــە گوشراوی جۆ وگووتی

یەکەمجار بیدەن بەم پیاوە ، دامیانی

جامەکـەم وەرگـرت و کــەمیکم لی خـواردەوە ، ئــەمیان واتــە گوشراوەکەی لای خۆم بەتامترو باشتر بوو لە گوشراوەکەیان

پاشان ئـەو وەریگـرت و لیـی خـواردەوە تـاکوو تـەواوی کـرد ، پاشان گووتی:

( ألحمد لله ألذی أطعمنا فأشبعنا و سقانا فأروانا )

لەم کاتەدا ئاورم لی دایەوەو گووتم

نامەیەکم بۆ هیناوی ئەی گەورەی بڕواداران

گووتی: لە کوی ؟

گووتم : لە لای سەلەمەی کوری قەیس

گووتی : مەرحەبا لە سـەلەمەی کوری قـەیس ، مەرحـەبا لـە نوینەرەکەی

دەی باسی موسلمانانم بۆ بکە

گووتم

چۆنی تۆ حەزی لێدەکەیت ئەی گەورەی بڕواداران ، سـەلامەتی و سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکانیان و دوژمنانی خوا

مزگینی سەرکەوتنم دایی و هـەوالی سوپام بـە دورودریـژی بـۆ باس کرد

گووتی :

ألحمدلله أعطى فتفضل ، وأنعم فأجزل

پاشان گووتی : ئایا بە بەسرا تیپەریت ؟

گووتم : بەلی ، ئەی گەورەی بڕواداران

گووتی : موسلمانان چۆنن ؟

گووتم: چاکن پەنا بە خوا

گووتی نرخی شتوومەك چۆنە ؟

گووتم نرخیان کەمترین نرخە

گووتی: ئـەی نرخـی گۆشـت ؟ چونکـە گۆشـت بربـرەی پشـتی عەرەبە ، عەرەب بی گۆشت ناتوانن

گووتم : گۆشت زۆرە بۆرە

ئاوری لە سندوقەکەی لای من دایەوەو گووتی:

ئەوە چیـیە لە دەستت ؟

گووتم کاتیك خودا سەر کەوتووی کردین بەسەر دوژمنەکانمان دەسکەوتەکانمان کۆکردەوە ، سەلەمە ملوانکەیەکی لەناو بینیـەوە ، بە موجاهیدەکانی گووت

ئەمەیان ئەگەر بەسەرتانی دابەش بکەم چیواتان بەر ناکەویت...

ئایا رازی دەبن ودەروونتان قەبول دەکـات ئەگـەر بـۆ گـەورەی بڕواداران رەوانەی بکەم ؟!

گووتیان : بەلی

پاشان سندوقەکەم دایە دەست ، کاتیك کردیەوە تەماشای نـاو سندوقەکەی کرد کەوا شتی سور و زەرد و کەسکی لەناو بینیەوە ، لە دانیشتنەکە راپەری ، دەستی خستە کەمەرەکانیەوە سـندوقەکەی

فڕی دایە سەر زەوی ، ئەو شتەی لە ناوی بوو پەرت و بلاو بـۆوە بـە هەموو لایەك

ئافرەتەكان وایان زانی من دەمەویت تیرۆری بكـەم ( بیكـوژم )، بۆیە هاتن بۆ لای پەردەكە ، پاشان ئاوری لە من دایەوەو گووتی:

كۆی بكەوە

بە سەركارەكەی یەرفەئی گووت:

لیی بدەو ئازاری پی بگەیەنە

من ئەوەی لە سندوقەكە پەرت و بلاو ببۆوە كـۆم دەكـردەوە و یەرفەئیش لیی دەدام

پاشان گووتی :

هەلسە بەسوپاس بۆتۆو نە بۆ هاورییەكەت .

پیم گووت:

وولاخمان بدەری بۆ ئەوەی من وسەر كارەكەم سواری ببـین بـۆ ئەهواز ، سەركارەكەت وولاخەكانی بردین .

گووتی: ئەی یرفـأ لە حوشترەكانی سەدەقە دوو ولاخی بـدەری بۆ ئەم وسەركارەكەی .

پاشان بە منی گووت:

ئەگـەر كـارت بـەم ولاخانـە نـــەما ویـــەكیكت بینـــی پیویســـتی پییەتی بیدەری

گووتم:

ئەی گەورەی برواداران دەیكەم ، بەلیدەیكەم (انشاء الله)

پاشان ئاوری لە من دایەوەو گووتی :

سویند بەخوا ئەگەر سەربازەكان پەرت وبلاوبـبن پیـش ئـەوەی بەسەریان دابەش بكەیت ، كاریكی پشت شكین بۆتـۆو براگەورەكـەت دەكەم

من لەو كاتەوە رۆیشتم تاكوو گەیشتمە لای سەلەمەوپیم گووت:

ئەم كارەی بۆمنت تایبەت كرد خوایگەورە پیرۆزینەكرد

ئەم ملوانكەیە بەسەر سەربازەكان دابەش بكە پیش ئەوەی من وتۆ تووشی كارەساتیك بین

جاكە هەوالەكەی پیدا لە دانیشتنەكە هەلنەستا تاكوو دابەشـی كرد بەسەریان

## ﴿١١٠﴾

# عوتبەی کوری ئەبان

## یاوەرێ زاهیدو موجاهیدو شەهید

بە راستی مرۆڤ دروستکراوی خوایە و بە دەستی قودرەتی خۆی لە گۆشت وخوین دروستی کردووە ، فیری کردووەو تیبگەیاندووە ﴿ الرحمن علم القران ، خلق الانسان ، علمه البيان ﴾ .

هەروەها ویستی خوا بۆمرۆڤ وابوو کۆبکریتەوە لە نیوان ماددەو روح ، هەر کاتیک ملکەچی ئارەزووەکانی ژیان بوو ، یان خۆشیەکانی نەفس زالبوو بەسەریدا ، ئەوا دەبیت بە یەکیك لەوانەی ئەوەیان لەسەر دەگووتریت :

(( جسم البغال و أحلام العصافير ))

واتە: کەلەشی وولاخ وبیرکردنەوەی چۆلەکە

هەروەها نابیت مرۆڤ هەرگیز لە خەلك جیا ببیتەوە و ببیت بە مجیور ، ببیت بە نمونەیەکی مردوو بەرامبەر کۆمەلگایەکی چالاك وزیندوو کەوا خوای پەروەردگار حەز دەکات بۆ خۆیان کۆمەلگایەکی ژیرو خواپەرست و بەرهەمدار و پیشکەوتوو دروست بکەن ، ئەو خودایەی دروشمی بۆ مرۆڤ ئەوەیە :

(( وابتغ فيما آتاك الله الدار الآخرة ، ولا تنس نصيبك من الدنيا ، وأحسن كما أحسن الله اليك ، ولا تبغ فسادا في الارض ، ان الله لا يحب المفسدين ))

ئەگەر هەزارەها کەس لە میژووی ئومەتەکەمان لایەنی جیابوونەوەو هەلاتن لەژیان وئەرکەکانی بەسەریاندا زالبووە ، لە لایەکی ترەوە ملیۆنەها کەسی تریش لەگەل رەشەبا پیشبرکی دەکەن و بە هەموو شیوەیەك مەبەست و ئارەزووەکانی خۆیان تیر دەکەن

هەروەها لە نیوان ئەم چینانەشدا چەند کەسیکی کەم هەن کە قارەمانانە توانیویانە نیوانی خواپەرستنی ناو مزگەوت و تیکۆشان و دونیایان بەیەکتر کۆبکەنەوە

یەکیك لەم یاوەرەدونیا نەویست و موجاهیدە لەخواترسانە

عوتبەی کوری ئەبانی کوری ثعلبە کەوا هاوریکانی نازناوی (عتبة الغلام ) یان ليناوه

واتە ~~عوتبەی میردمندال~~ ...

ئەم نازناوەش بۆ بچووك كردنەوەو سووك كردن نەبووە ، بەلكوو ئەم نازناوەیان لەبەر ئازایەتی و چوست وچالاكی ليناوە ، هەروەها عوتبە لە ژیانیدا زۆر بە سووكی وئاسایی ژیاوە بەبی ئەوەی مەرەق و خولیای خواردن وخواردنەوە یان جل وبەرگ یان كەلوپەلی ژیان ببیت

عوتبە ﷺ ئەگەر بانگ کرابا بۆ خواردنی خۆش وبەتام ، ئەوا قەرەبووی ئەم خواردنەی دەکردەوە بە خواردنیکی ئاسایی و ئەم وتەی دوبارە دەکردەوە

من دەترسم رۆژی قیامت پیم بلین : { أذهبتم طيباتكم في حياتكم الدنيا ، واستمتعتم بها ، فاليوم تجزون عذاب الهون بما كنتم تستكبرون في الأرض بغير الحق ، وبما كنتم تفسقون } .

واتە: ( ئایا بەدوای خۆشیەکانتان کەوتوون لە ژیانی دونیاتان ، و تام و چیژتان لیی بینی ، جا ئیمرۆ ئازاری گەورە بچیژن بەوەی لەسەر زەوی بەبی ماف راتانبواردوفیزتان لیدا و بەوەی پیی لە ریگا دەرچوون )

جاریکیان عوتبە دەگات بە سولەیمان کوری عەلی کوری عبداللە کوری عباس کەوا لە سالی سەدو چل ودووی کۆچی کۆچی دوایی کردووە ، هەروەك لە کتیبی ( ألاعلام ) دا باس دەکات .

کاتیك سولەیمان چاوی بە دونیا نەویستی عوتبە دەکەوی و گویی لە قسەکانی دەگریت ، بە هەموو هیزیکیەوە رووی لە پەروەردگاری کردووە و دەلیت :

دەبینم عوتبە بەراستی خۆی دۆزیوەتەوە و گوی‌نادات بەوەی ئیمە چیمان هەیەو چیمان نیە لەم دونیایە

ئەوەبوو سولەیمان دیاریەکی بە نرخی پیشکەش بە عوتبەی کرد ، بەلام ئەو وەرینەگرت .

عوتبە ﷺ گرنگی نەدەدا بە جوانکاری دەرەوەی و کردەوەی بەرچاو بەرامبەر بە خەلك ، هەروەها ووشەی ستایش و پیداهەلگووتنی لە لا گرنگ نەبوو ، لەگەل ئەمەش دلی زۆر فرەوان

بوو ،ووشەی ڕەخنە دلتەنگی نەدەکرد کاتێك قسەیان لەسەر کردبایە ، بەلکو بەراستی خۆی خەریك کردبوو بە شـتێکی گرنگـتر وگـەورەتر لەمانە

بەلی عوتبە خەریك بوو بە چاککردنەوەی ئیمانی و پتەو کردنی پەیوەندی بە پەروەردگاری و خۆشکردنی جێگای لەلای خوای گەورە بە هۆی گوێرایەلی وملکەچی وخواپەرستی ، هەروەها وای تێدەڕوانی داواکردنی جێگای بەرزو بریقەدار لەلایەن خەلك دەبێتە هـۆی نـەمانی پلەو پایە و حورمەت لەلای خوای گـەورە ، هـەروەك ئەحمـەد کـوری زوهەیری مەروەزی دەلێت

( والله ما كان أحد منا الا تمنى ان يكون له فـي نفـوس النـاس قـدر ومنزلة ، الا عتبة ، فقد كان يرى ان ابتغـاء المنزلـة عنـد النـاس سـقوط للمنزلة عندالله ).

واتە: ( سوێند بـەخوا هیـچ کەسـێك نـەبوو لەئێمـە حـەز نـەکات ڕیزوپلەوپایەی نەبێت لە نێو دلـی خـەلکدا ، تەنـها عوتبـە نـەبێت ، بەراستی وای تێدەڕوانی داوا کردنی پلەو پایـە لـەلای خـەلك دەبێتـە هۆی نەمانی پلەو پایە لە لایەن خودا ).

عوتبـە ﷺ دەیزانـی سروشـتی ژیـان کـەوا هـەق وناهـەق تێیـدا هـەردەم لـە ململانیـدان کۆتـایی دێـت بـە سـەرکەوتنی هـەق ، بۆیـە بەردەوام خۆی ئامادە دەکرد بۆ جیهاد لە ڕێگای خودا ، ئەم ئامـادە باشـیەش کـاتێك دێتـە جـێ پـێش ئـەوەی سـوپا دروسـت بکرێـت ، پێویستە دلەکان پاك بکرێتـەوە پـێش ئـەوەی بـرای موجـاهید چـەك هەلبگرێت ، پێویسـتە پـەروەردەی ئیسـلامی بدرێـت و دل و دەروون پربکات لە ئیمان پێش ئەوەی بچێتە گۆرەپان چونکە مرۆڤی بـڕوادار ئەگەر لە جەنگی شەیتانی گەل خۆی سەرکەوت ودلی پاك کردەوە لە هەموو خلت وخالیك و ژەنگ وژاریکی گوناهو تاوان ، دلسـۆز بـوو بـۆ خودا ، ئارەزووە دونیایی یەکانی خۆی لە ژێر پێی خۆی دانـا ، ئـەوا دەتوانێت سەربکەوێت وخۆراگر بێت کاتی گەیشتنی بە دوژمنەکانی

لەبەر ئەوە عوتبە دەیگووت

( لن تنصرالله فی معركة حتى تنصره على نفسك بتغليب امره علـى هواك، فان منت فارس هذه المعركة، فأنت فارس المعركة الاخرى باذن الله).

واتە: ( خوا سەرکەوتووت ناکات لە جەنگێك تاکوو سەرکەوتوو نەبیت بەسەر دەروونی خۆت بە سەرخستنی فەرمانەکانی خوا بەسەر ئارەزووەکانت ، جائەگەر تۆ سوارچاکی ئەم جەنگە بوویت ، تۆ دەبیت بە سوارچاکی جەنگەکانی تریش بە یارمەتی خودا ).

لەبەر ئەمە سەرەتا عوتبە خۆی خەریك کرد بە نەفسی خۆی ، ئەوەبوو دل ودەروونی خۆی پاك کردەوە و پەیوەندیەکی بە هیزی دروست کرد لەگەل خوای گەورە و ملکەچ بوو بۆ فەرمانەکانی ودەست وبازووی مەردایەتی و جوامیری لی هەلکرد ، پاشان هەروەکو موجاهیدیك لە پیناوی خوا رووی لە ولاتیشام کرد دژی رۆمە ستەمکارەکان

عوتبە ﷺ پیاویکی کەلەش بچووك وکورتە بالاو بی هیزبوو ، جاویستی ئەم کەم وکورتیە لە جەستەی قەرەبوو بکاتەوە بەجەنگ کردن بە هۆی سواربوونی وولاخیکی بەرز ، بۆ ئەوەی بەرزو گەورە دیار بیت ، بیگومان ئەم کارەش تەنها لەکاتی جەنگی دوژمنان ریگەی پیدراوە بۆ ئەوەی زیاتر دوژمن بتۆقینیت

کاتیك عوتبە ﷺ پیشوازی لە جیهاد دەکرد جیاوازی نەدەکرد لە نیوان ژیان ومردن ، جاژیان لەلای ئەمدا تەنها بریتی بوو لە دریژبوونەوەیەکی کاتی بۆ خواپەرستی و گویرایەلی ، وە مردن لەلای ئەو تەنها بریتی بوو لە گەشتیك کە دەیکات و پاش کەمیکی تر دەگاتە لای پەروەردگاری ، جا لەبەر ئەمە گرنگی نەدەدا بەوەی ئایا بەسەر مردن دەکەویت یان مردن بەسەر ئەمدا دەکەویت

هەروەها عوتبە هەموو هیواو ئاواتی ئەمەبوو خوای گەورە بەخششی شەهادەتی لەریگای خۆیدا پی ببەخشیت بەلکو لەگەل ئەمەشدا هیواخواز بوو ئەم نزایەی قەبوول بکریت

( اللهم احشر عتبة بين حواصل الطير و بطون السباع )

واتە خودایە عوتبە کۆبکەیتەوە لە نیو سیقەتۆرەی بالندەو سکی درندە ).

چونکە مەبەستی ئەوەبوو بە شەهیدی بمریت و درندە و بالندە کەلەشەکەی بشکینن وپاشان نەمینی بۆ ئەوەی خەلك سەردانی گۆرەکەی بکەن و گومبەتی لەسەر دروست بکەن و خەلك لە دەوری

کۆببنــەوە ، تــاکوو بــە جیــهادە پــاك وبیگەردەکــەی بگــات بــە پەروەردگاری وبە مەزنترین پاداشت پاداشت بدریتەوە.

موخەلــەد کــوری حوســەین ﷺ ( یــەکیك بــوو لــە هاوریێــەکانی عوتبە) لە خەودا بینی فریشتەیەك هاتــە خــوارەوە ، جــا هــەندیك لــە موجاهیدەکانی بە کفنەکانی لای خۆی کفن کرد

یەکیك لەوانەی بەو کفنەی کفن کرد عوتبەی کوری ئــەبان بــوو ، موخەلــەد چــووە لای عوتبــەو هــەوالی ئــەم خەونــەی پیگــەیاند ، جــا مزگینی بە عوتبە دا کەوا پــاش کــەمیکیتر بــە خــیر دەگــات ، بــەلام هاوریکەی تکای لیکرد ئەم خەونەی لای کەس باس نەکات .

ئەوەبوو جەنگیك روویدا لــە نیــوان موســلمانان وبــی بــاوەران ، عوتبە ئەوەي بە دلیداهات کــەوا رۆژی شــەهیدبوونی نزیــك بۆتــەوە ، جابە موخەلەدی هاوریکەی گووت

خەونەکەت دوبارە بۆم بگیرەوە ، بەراستــی مــن بروایــم وایــە کاتەکە نزیك بۆتەوە

موخەلەد دوبارە خەونەکەی بۆ گیرایەوە

چەند ساتیکی نەبرد جەنگ دەستی پیکرد و شــەر گــەرم بــوو ، عوتبە لە ریزی پیشەوە لەگەل کۆمــەلیك لەهاوریێە موجاهیدەکــانی وەك شــیر هیرشــیان بــردە ســەر دوژمنــەکانیان ، ئــەوەبوو تیکهەلچوونیکی توند لە گەل ریزی پیشەوەی دوژمن دروســت بــوو ، عوتبە تەکبیری لیدەداو دەیگووت :

( اللهم ارزق عتبة اليوم شهادة تقر بها أعين المسلمين )

واتە: خودایە ئەمرۆکە شەهادەت ببەخشــی بــە عوتبــە و چاوی موسلمانان پیی روون بکەیتەوە

ئەوەبووعوتبە زەرەر و زیانی کوژراویکــی زۆری بــە دوژمنــەکانی گەیاند ، ئەوانەی دوژمنداری خواو ئیســلام و موســلمانانیان دەکــرد ، ئەوەی کرا ئەو پییکردن ، کەلاکەکانیان لە دەوری بــلاوەی کردبــوو ، هەروەکو بلییت تورەیی قەدەریان بۆ هاتبیتە خوارەوە بۆ ئەوەی ئەم ستەمکارانە بەمجۆرە کەل و کورم بکرین .

بەلام حەفت کەس لە دوژمنــە سپلەکان ســەنگەریان لــە عوتیــە گرتبوو ، لە دواوە بە دەستە چەپەلەکانیان لــە عوتبــەیان داو عوتبــە

لەسەر وولاخەکەی بە شـەهیدی کەوتـە خـوار ،لـەم کاتانـەدا هـاواری دەکردو دەیگووت :

اللّٰه اکبر ، فزت ورب الکعبة .

واتە: اللە اکبر ، سویند بە خوای کەعبە سەرکەوتم

شایانی باسـە لـەم کاتـە تەمـەنی سـی سـال بـوو ، بـە لـی شـەهیدبوونی عوتبـە تەزوویـەکی کارەبـایی لـەناو دلـی هاوریکـانی دروسـت کـردو گروتـین وئـارامیکی زۆری پـی بەخشـین ، هـەموویان پەیمانیان لەگەل ناخی خۆیان تازە کردەوە کەوا شوینەکانی خۆیـان جی نەهیلن تاکوو یان سەرکەوتن بەدەست دەهینن یان بـە شـەهیدی بە خزمەت پەروەردگاریان دەگەن

چونکە یەقینیان هەبوو کەلەگەل تکان ورژانی یەکـەم دلۆپ لـە خوینـی ئـال وپاکیـان خـوای میـهرەبان لـە هـەموو تـاوان و سەرپیچیەکانیان خۆش دەبیت و لییـان رازی دەبیـت ، جـاچ شـتیك هەیە لەو سەرکەوتنە گەورەتر بیت کە خوات لی رازی بیت

ورضوان من اللّٰه اکبر .

ئەوەبوو بـەو ئاواتـە شـەریان کـرد تـاوەکوو یـەك لـەدوای یـەك شەهید بوون ، هەرهەموویان لە کۆتایی ژیانیـان دروشمیـان ئـەوەبوو کە دەیانگووت

اللّٰه أکبر ، فزت ورب الکعبة .

سبحان اللە ، شەهید دەبوون ودەیانگووت

سویند بەخوا سەرکەوتین

بەراستی ئەوان راستیان فەرموو . راسـتە شـەهیدیان دا ، بـەلام ئەمە نرخی سەرکەوتنەکەیان بوو .

پاش تەواوبوونی جەنگ خەلك بەریکەوتن بۆ ئەوەی شەهیدەکان بـە خـاك بسـپیرن ، بـەلام ئـەوەی جیـی سەرسـورمان بـوو لاشـەی عوتبەی کوری ئەبانیان نەدۆزیەوە

کـی دەزانـی ؟؟...

لەوانەیـە خـوای گـەورە نزاکـەی عوتبـەی گـیرا کردبیـت کـە دەیگووت : اللهم احشر عتبة بين حواصل الطير و بطون السباع

**رەزای خودا لە عوتبەی کوری ئەبانی دونیا نەویست و موجاهید وشەهید**

# ﴿ ١١١ ﴾

# شەماس کوڕی عوسمانی شەریدی مەخزومی

## موجاهیدێکی نەناسراو

# ﴿١١١﴾
# شەماس کوری عوسمانی شەریدی مەخزومی
## موجاهیدێکی نەناسراو

میـژووی تیکۆشـانی مرۆڤایـەتی بۆمـان روون دەکاتـەوە کـەوا خەلکانیکی زۆر بەشداری گۆرە پانی جیهادو تیکۆشانیان کردووە بـە چـەند کرداریکـی جیاواز بـەلام ناویـان وون بـووە ، پاشـان چـەند بارودۆخیکیان رەخساوە کەوا ماددەی زیـری رەسـەنیان بـۆ لـە ژیـر خاك بە دیار بکەوی و ناوی پرشنگداریان ببریسکیتەوە و هەوالیان لە نیو خەلك بلاو ببیتەوە و سیرەیان لە گویـی خـەلك دەنـگ بداتـەوە و میژوویان لەبەر چاوان گەورە بیت .

لەگـەل ئەمانـەش خـەلکانیکی وا هـەبووە بــە باشــترین شـیوە بەشداری تیکۆشانیان کردووە ، بە بی دەنگـی ودلسـۆزی و ئـارامی ، پاشان ریگای خوایان گرتۆتەبەر بە سەرفرازی شەهیدبوون بی ئەوەی خەلك ناوبانگیـان بزانـی و بـەبی ئـەوەی میـژوو باسـیان بکـات ، جا ئەمانە بوون بە موجاهیدی نەناسراوو چاوەریی پاداشتی گەورەیان لە پەروەردگاری پاداشت دەر کردووە

جا ئـەم چینە بەریزە مەزنە لـە موجـاهیدان ، ریبـازی ویژدانمـان داوامان لی دەکات باسی پیاوەتی ئەم کەلە پیاوانە بکەین بـۆ ئـەوەی موجاهیدانی ئەمرۆمان ریگای ئەم کەلەپیاوانـە بگرنـە بـەرو هـەندیك پەندو ئامۆژگاری لەمانەوە وەربگرن

( ان فی ذلك لذكرى لمن كان له قلب أو ألقى السمع وهو شهيد ) .

وە میژووی ئیسلامی زیرینمان سەدەها هــەزار کەلـە پیـاوی وای بەخۆوە گرتووە ، ئەوانەی خوای گەورە هیدایەتی داون بۆسەر ریگای هەق و بارگاوی کردوون بۆ ئامادە بوونیان لەسەر گۆرەپــانی خـۆ بـە قوربانی دان و پاشان بەری کـەوتن بـۆ لای پـەروەردگاریان ، خـواش ئەم کردەوەیانی بە جوانترین شیوە لی وەرگرتن و پاداشت درانەوە بە گەورەترین پاداشت بـە پیچەوانـەی ئـەم پاداشـتە کەمـەی لـە لایـەن خەلکی دونیا پاداشت دەدرینەوە

وه ئەم كەلــە پيـاوەی دينـە سـەری يەكێكـە لەمانـەی زۆربـەی خەلك نايناسن ، بەلام لەلای پەروەردگاری ناسراوە و بە مەزنترین ریز ریزی لی گیراوە :

﴿ وما كان الله ليضيع ايمانكم ، ان الله بالناس لرؤوف رحيم ﴾

ئەم كەلە پياوە ناوی :

شەماس كوری عوسمانی شەریدی مەخزومی یە ، وابزانم كـەس لە ئيمە نە ناوی ئەم كەلە پياوەی بيستووە و نە شتێكی دەربارەی خوێندۆتەوە نە بەدوای سیرەو ژياننامەی دا گەراوە ؟!!

لەگـەل ئەمەشـدا يـاوەرێكی بـەريزی پێغەمبــەری خوايــە ﷺ ، سـوارچاكێكە لـە سـوارچاكانی ئيسـلام و قارەمانێكەلـە قارەمانـــانی ئيمان

دايكی ناوی ( سەفيە كچی رەبيعە كوری عبد شمس كوری عبـد مناف ) ـە ، هـەنديك دەلـين نـاوی عوسمـان كـوری عوسمـان كـوری شەريدە ، بەلام ناوبانگی رۆيشتووە بە شەماس كوری شـەريد ، ئـەم شەماسەش نازناويەتی ، دەلين ئەم نازناوەيان ليناوە لەبـەر ئـەوەی يەكەم كاری لەلای شەماسە بووە ( ئەوانەی لە خزمەتی كەنيسە دان لە لای فەلەكان )

وه دەلـين بۆيـە ئـــەم نازنـاوە ی هــەلگرتووە لەبــەر جوانـــی روخساری بــووە ، نيوچـەوانی وەكـو رۆژ دەبريسـكايەوە ، هــەروەها دەلين لەبەر ئەوەی زۆر لە پياوێكی خزمەتكاری كەنيسە چووە كەوا لە جاهيليەت بە نموونەی جوانی روخساری باسيان ليوە كردووە

جا كوری شەريد بە جوانترين روخسار پــەروەردە بـووە ، لەبـەر ئەوە لەوانە بوو ئەم جوانيە ی لە ژيانيدا بە گرانی لەســەر بكـەويت و رايبكيشـيت بـۆ ئارەزووەكـانی و رابواردنـی دونيـا ، بـەلام شـــەماس ئەمانەی قەبول نەكرد و ریگای ئيسلام و هيدايەتی هەلبژارد و ریگای بۆ رووناك بۆوە بە رووناكی ئيمـــان ، هەرلـە زووەوە هاتـە نـاو ريـزی موسلمانان ، لە كاتێكدا لەو پەری گەنجی دابوو .

لە گەل ئەوەی شەماس لە هۆزێكی خاوەن پلەو پايە بوو بـەلام ئەو تەنها شانازی بە سەرفرازی خوای تاك وتەنيا دەكرد و ئامادە بوو لە پيناوی بيروباوەرەكەی چەندەها جۆر بەلاو كارەساتی بەسەر بيت

، جالەگەل پیشەنگە موهاجیرەکان کۆچی کرد بۆ حەبەشە ، پاش ماوەیەك لەگەل کۆمەلیك گەرایەوە بۆ مەککە ، پاشان لە مەککە کۆچی کرد بۆ مەدینە ، جا ئەم یاوەرە لە خاوەن دوو هیجرەتەکان بوو لە پیناوی خوای گەورە

پیغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە برایەتی خستە نیوان شەماس و موجاهیدی کۆلنەدەر ( حنظلە ی کوری أبی عامر ) کە بەناوبانگە بە نازناوی ( غسیل الملائکە ) ، کاتیك ئەم یاوەرە بەختەوەرە تازە زاوابوو بانگدەر بانگی جیهادی لیدا ئەویش لەم سات وکاتەدا جەنابەتی لەسەر بوو کەوا دەرچوو بۆ جەنگی ئوحود ، پاشان بەخششی شەهادەتی پی بەخشرا ، ئەوەبوو پیغەمبەری خوا ﷺ بە یاوەرەکانی فەرموو:

دەبی ئەوە مانای چی بیت ، هاوریکەتان فریشتەکان شوشتیان ، جا برۆن لەم مەسەلەیە پرسیار لە خیزانەکەی بکەن

کاتیك پرسیاریان لیی کرد ئەویش گووتی

بەراستی کاتیك گویی لە بانگی جیهاد بوو بە خیرایی هات بەرەو پیریەوە بەبی ئەوەی گوی بدات بەوەی جەنابەت لە خۆی دەربکات

ئەوەی جیگای سەرسورمانە هەموو ئەو یاوەرانەی پیغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نیوانیان ، زۆربەیان لە سیفەت و کارو کردەوە لە یەکتری دەچوون ، جا دەبینین ئەم دوو یاوەرە لە هەموو روانگەکان پەیمانی برایەتیان لەکەل یەکتر دابەست ، هەروەك لە ژیان لەگەل یەکتردابوون بەبرا ، لە مەیدانی جیهادو شەهیدبوونیشدا پەیمانی برایەتیان لەگەل یەکتردابەست ، هەروەها لەکات و شوینی شەهید بونەکەش پەیمانیان لەگەل یەکتردا ، جا خوای گەورەش هەردوکیانی لەیەك جەنگدا شەهید کردو بۆ خۆی بردنیەوە

شەماس کوری شەرید جەنگی گەورەی بەدری بینی ، جا شانازی و پاداشت وئەم مزگینیە گەورەی بە دەست هینا ، پاشان جەنگی ئوحودیشی بینی ، ئەوەبوو بە گەورەترین بەشداری تیداکرد ، کاتیك دوژمنە ستەمکارەکان گەیشتن بە پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی پەلاماری بدەن شەماس لەنزیکی وەستاو بەرگری لیکرد و روحی پاکی خۆی بە قوربانی کرد و گویی نەدەدا بەم لیدانانەی پیی دەکەوت لەراست وچەپ ، تاکوو وایلیهات لەم رۆژەدا پیغەمبەری خوا

ﷺ به قەلغان ناوی بهێنیت لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای ڕاست وچەپی خۆی دەکرد دەیبینی شەماس لە بەرامبەری وەستاوەو بە شمشیرەکەی بەرگری لیدەکاو جەستەی خۆی کردووە بە قەلغان بۆ پاریزگاری لە روحی پاکی پێغەمبەری خوا ﷺ

سەخاوی لە کتابی ( التحفة اللطيفة ) ریوایەت دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە شەماس فەرموویەتی:

﴿ ما شبهت بعثمان الا الحية ﴾

واتە : عوسمانم بە هیچ شتێك نەشوبهاندووە تەنها بە مار نەبێت. ئەمەش لەبەر لیزانی و شارەزایی لە جەنگ بۆ بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ

پاشان لە گۆرەپانی جەنگ شەماسیان بە برینداری هەلگرتوو گەراندیانەوە مەدینە ، ئەوەبوو چەند ساتێك لە ژیانی مابوو لە نیوان ژیان ومردندا ، هەروەها لە مەدینە کەسوکاری پیشبرکییان دەکرد لە مانەوە لە لای ، هەروەك ئەمە سیفەتیان بوو لە چاودیری موجاهیدان.

پاشان هەلیان گرت بۆ لای خاتوو عائیشە ـ رەزای خوای لیبیت ـ بەلام خاتوو أم سلمە کەوا لە خزمایەتی زۆر لە شەماس نزیك بوو داوای مافی خۆی کردو گووتی

کورە مامم دەبەنەلای یەکیکی تر ؟؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

﴿ احملوه الى أم سلمة ﴾ .

واتە هەلیبگرن بۆلای أم سلمە

جابردیان بۆلای ئەوو شەوورۆژیك لە ژیان دامایەوە بەبی ئەوەی هیچ بخواو بخواتەوە ، شەماس لە نیوان ژیان و مەرگ دابوو ، پاشان گیانی پاکی بۆلای پەروەردگاریبەرز بۆوە بۆ ئەوەیلە جیگای بەرز لەلای پەروەردگار میوان بیت .

کاتیك هەوالی کۆچی دوایی شەماس گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەهەلگرتنی تەرمەکەی بۆ ئەو شوینەی شەهیدەکانی جەنگی ئوحود تییدا بە خاك سپاردراون بۆ ئەوەی بە جل و خوینی خۆی لەم شوینە بەخاك بسپیردری ، بەبی ئەوەی نویژی لەسەر بکریت

جا کۆمەلەکە ئەوەی پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پیکردبوون بە جییان گەیاند ، و بە دەستی پیرۆز و ریزەوە تەرمەکەیان هەلگرت بەبی‌ئەوەی بیشۆن ونویژی لەسەر بکەن یاخود شتیك لە جل وبەرگی دابرنن کەوا بە خوینی پاکی پیی رازابۆوە بە خوینی جیهاد

بەمجۆرە ئەم شەهیدە بەنازە گەیشتە گۆرەپانی ئوحود ، تاکوو ئەم یاوەرە بەریزەش گە یشتەوە براکانی هاوریی چەك وجیهاد لە شەهیدەکان ئەوانەی راستیان کرد لەوەی خوا پەیمانی پیدابوون لەم شوینە ناشتیان

کاتیك ئەم هەواله گەیشت بە خیزانەکەی ( نعم کچی سەعید کوری یەربوع ) هەروەکوو بلییت خەمەکانی پیشووی لە یاد بچیتەوەو بەردەوام بیت لەسەر تیکۆشان ئەم چەند دیرە هۆنراوەی بەسەردا هەلگووت :

| | |
|---|---|
| یاعین،جودی بفیض غیرابساس | علـى كريم مـن الفتيـان لبـاس |
| صعب البديهة ، ميمون نقيبتـه | حمـال ألـوية ،ركـاب أفـراس |
| أقول لما أتى الناعي له جزعـا | أودى الجوادوأودى المطعم الكاسی |
| وقلت لما خلت منه مجالسـه | لايبعـد الله منـا قرب شماس |

شەماس کوری شەریدلە تەمەنی سی وچوار سالیدا بوو کاتیك بەخششی شەهادەتی پی بەخشرا لە پیناوی‌خوای گەورە

لە کۆتاییدا لە خوای گەورە داواکارین سیفەتی بی‌دەنگی و نەناسراوی و خۆراگری بدات بە موجاهیدە خۆراگرەکانمان ، ئەوانەی تەنها بۆ ئیسلام دەژین و تەنها بۆ ئیسلام دەمرن ، تاکە ئاواتیان بەرگری کردنە لە موقەددەساتی ئیسلام و موسلمانان ، هەمووکات گیان لەسەر دەستن بۆ رووبەروو بوونەوەی دوژمنانی ئیسلام و قورئان

**خوای گەورە لە موجاهیدی نەناسراو شەماس کوری عوسمانی شەریدی مەخزومی رازی بیت**

# (١١٢)

# عائیشە کچی ئەبوبەکری صدیق

نیوەی ئایینەکەتان لەم حمیرانە وەربگرن (واتە عائیشە)

پێغەمبەری خوا ﷺ

ئەبوبەكر لە مالی خۆی بانگی عائیشـەی كـرد كـەوا تەمـەنی لـە دەوری نۆ سـالیدابوو ، هـەر لـە نـاو منـدالان یـاری دەكـرد ، پاشـان ئیمامی ئەبوبەكر قاپیك خورمای پیداو داوای لیكـرد بیبـات بـۆ مـالی پیغەمبەری خوا ﷺ و پیی گووت بلیت

ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەوە هـەمووی ئەوەندەیە لەلامانـە ، جا ئایا رازی دەبیت ؟؟

عائیشەی میردمندال بە خیرایی رۆیشت بۆ مالی پیغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش پیشوازی لیكـرد ، ئینجـا سـلاوی لیكـرد پاشـان ئـەوەی پییدرابـوو پییـدا ، ئەوەشـی پیگـووت كـەوا بـاوكی فـیری كردبـوو ، پاشان دوبارە گەرایەوە مالی باوكی ،باوكی لیی پرسی

چی فەرموو ئەی رۆلەكەم ...؟

ئەویش وەلامی دایەوە و گووتی

فەرمووی : ﴿ نعم ، وعلى بركة الله ﴾.

واتە  بەلی ، لەسەر بەرەكەتی خوا

بەمجۆرە عائیشـە چـوو بـۆ مـالی پیغەمبـەری خـوا ﷺ بۆ جی بـەجیكردنی فـەرمانی بـاوكی لـە كـاتیكدا نـەیدەزانی مەبەسـت لـەم سەردانە چیە و نیازیان چیە !! لەبـەر ئـەوەی لـەم سـات وكاتـە لـە تەمەنیكدابوو شتی وای بە خەیالدا نەدەهات

ئیـتر دەروونـی صددیـق ﷺ ئـاوی خـواردەوە بـەو پـەری كـەیف خۆشیەوە بە وەلامەكەی پیغەمبەری خوا ﷺ كەیف خۆش بوو

بەلام لەناكاو خەم وپەژارەیەك لە سەر دەم وچاوی دەركەوت لە كاتیكدا هیشتا كەیف خۆشی لەسەر روخساری مابوو ، ئەمەش لەبەر ئەوەی بە یادی هاتەوە كچەكەی خوازبینی كراوە لە لایەن ( جوبـەیر كوری موطعیم كوری عەدی ) ، جاچار چیە ؟؟

چ فیلیك ببینیتەوە بۆ ئەوەی لەم گرفتە رزگاری ببیت ؟

بۆیە دەستی كرد بە بیركردنەوە لەم كارە ، پاشان بـیری رونـاك بـۆوە بـۆ ریگایـەك رزگـاری ببیـت لـەم بەلینـەی دابـووی بـە كۆنـە هاوریكەی ( موطعیم ) .

عائیشە بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ داخوازی كرا لەكاتیكدا لە تەمەنی نۆ سالیدابوو ، ئەم كارەش بـە نـهینی مایـەوە و كـەس پیـی نـەزانی بیجگە لە پیغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەكرو خیزانەكەی .

پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر دەچووە مالی ئەبوبەکر ی خەزوری جا ئامۆژگاری دەکردن لەگەل عائیشە چاك بن ، لە کاتیکدا عائیشەی میردمندال هیچی نەدەزانی لە کاروباری ژیان تەنها شتیکی کەم نەبیت ، هەروەها لە گەل کچە هاوشانەکانی خۆی زۆربەی کاتەکانی بە یاری دەبردە سەر

بەمجۆرە ئەم خوازبینیە رۆژ بە رۆژ پەیوەندی خۆشەویستی و هاوریێتی و برایەتی نیوان پیغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر ﷺ پتەوترو بەهیزتر دەکرد ، ئیتر هاورییەتیەکەیان لە رادەد بەدەر بە هیزتر بوو .

چەند سالیکی بەسەردا رۆیشت

سالانی تیکۆشان و جیهاد ، هەتا کۆچیان کرد بۆ یەثریب (مەدینە ) پاش ئەوەی موسلمانان جینشین بوون لە مەدینەی پیرۆز و بە رووناکی پیغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خرایە نیوان موهاجیرو ئەنصار ، ئەوس وخەزرەج کۆکرانەوە لەسەر ریگای ئیمان و ئیسلام ، پەیمان بەسترا لەگەل جولەکە نەفرەت لیکراوەکانی مەدینە بۆ ئەوەی دەستی ستەم دریژ نەکەن ، هەر کاتیکیش ستەمیان کرد دەستیان ببریت

رۆژیکیان ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ لە کاتی حەسانەوەو خۆشی هاتە لای پیغەمبەری خوا ﷺ و پیی گووت :

چی قەدەغەت دەکات دەستگیرانەکەت ناگوازیتەوە ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ؟؟

لیرەدا پیغەمبەری خوا ﷺ بە ئاگا هاتەوە ، ماوەیەکی زۆر لە مەسەلەی خوازبینی عائیشە بیری کردەوە کەوا چەند سالیکی بەسەردا تیپەریبوو ، ئەمرۆکەش عائیشە بە تەواوی پیگەیشتووە ، تەمەنی سیزدە سالانە جا ئاوری لە ئەبوبەکر دایەوە و بە زەردەخەنەیەك وەلامی ئەم پرسیارەی ئەبوبەکری دایەوە

عائیشە ﷺ چووە مالی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم بووکۆکانەشی لەگەل جیهازی بوکینی برد کە بە مندالی گەمەو یاری پیدەکردن ، هەرچەندە عائیشە تەمەنی کچیتی تەواو کردبوو بەلام هەر عەقلی سادەو ساکار بوو ، هەمووکات وەکوو مندال بیری دەکردەوە

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە ماڵەوە بینی عائیشە بووکەکانی ڕیز کردووە ، بۆ هەندێکیان باڵی دروست کردبوو ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرد ئەوە چی دەکەیت ؟

ئەویش گووتی:

ئەوانە ئەسپەکانی سولەیمانن

پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی زۆری کرد و پرسیاری لێکرد

**﴿ وما هذه الاجنحة ﴾؟**

واتە: ئەی ئەو باڵانە چین ؟

گووتی: ئەدی ئەسپەکانی سولەیمان باڵیان نەبووە پێی فڕینە ؟

جا پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پێکەنی

منداڵیەتی عائیشە زۆر خۆشەویست بووە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەرگیز پێی دڵتەنگ نەبووە ، بەڵکوو وەکو باوکێکی بەبەزەیی وبە سۆز چاودێری دەکرد ، ئەمەش چۆن وانەبێت ؟ خۆی پێغەمبەری بەزەییە ، دەیفەرموو

**﴿ استوصوا بالنساء خيرا ﴾**...

واتە : ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵ ئافرەتان چاك بن

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕێتەوە ماڵەوە دەبینی عائیشە خەو دەیباتەوە و حەیوانات نانەکانی دەخۆن ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە پێکەنی و پاشان بە ئاگای هێنایەوە زۆر بە نەرمی و نیانی

جا بە ڕاستی موحەممەد ﷺ مامۆستایەکی مەزن و باوکێکی بەڕێزو مێردێکی بەوەفا بوو ، وە بەم سیفەتە بەرزانە توانی ڕیبازەکەی خۆی بهێنێت بۆ ئادەمیزادو لە کارەکەی سەرکەوت

عائیشە ؓ گەورە بوو ، بیرو هۆش و تێگەیشتنی پێگەیشت جابوو بە گەورەی ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، چاودێری کاروباری خۆی دەکردو کارەکانی خۆی ڕادەپەڕاند

گوێڕایەڵی ئەو کارانەشی دەکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ دەکرد ، هەروەها زۆر لەکارو کردەوەو ووتەکانی لەبەر دەکرد ، بەباشترین کاری ماڵداری خێزانداری هەڵدەستا ، پێغەمبەری بەوەفاش ﷺ ئەم هەڵس وکەوتانەی لی بەدی دەکرد لەبەرئەوە لە

هەموو خیزانەکانی زیاتر خۆشی دەویست ، بەزیرەکی و وەفاو هەست ونەست و تیگەیشتنی عائیشەی زانی ، تاکوو رۆژیکیان فەرمووی :

﴿ خذوا نصف دینکم عن هذه الحمیراء ﴾ . . .

واتە: نیوەی ئایینەکەتان لەم سورکۆکە( واتەعائیشە) وەربگرن ئەمەش بەهۆی ئەو زانست و زانیاریانەی لە مامۆستاکەی واتە میردی دلسۆزی وەریگرتبوو .

خۆشەویستی پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشتبووە سنوریك تاکوو وای لیهاتبوو خیزانەکانی تری ئەوەیان پیخۆش نەبیت ، تاکوو وایان لیهات زەهرای کچی پیغەمبەری خوا ﷺ بنیرنەلای داوای ئەوەی لیبکەن بە یەك چاوی خۆشەویستی تەماشایان بکات

فاتیمەی زەهرا هاتەلای باوکی بە هۆی هەلویستی نارەزایی خیزانەکانی ، ئەوەبوو پیغەمبەری خوا ﷺ بەرهەلستی نواند بەرامبەر داواکەی زەهراو کاتیك زەهرا چەند جاریك ئەم ووتانەی دوبارە کردەوە ، پیی فەرموو :

﴿ أو لست تحبین ما احبه ﴾؟.

واتە: ئایا یەکیکت خۆش ناویت گەر من خۆشم بویت ؟

جا وەلامی دایەوە

بەلی ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ! !

پیغەمبەری خوا ﷺ پیی گووت :

کەواتە عائیشەت خۆش بویت

جا فاتیمە بیدەنگ بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ دەرهەق عائیشە فەرمووی :

﴿ فلیتقین الله فی عائشة ، فوالله ما نزل علی الوحی وأنا فی فراش واحدة منهن غیرها ﴾ . . .

واتە : جا سەبارەت بە عائیشە لەخوا بترسن ، سویند بە خوا هەر نیگایەکم بۆ دابەزیبی من لەگەل عائیشە لە سەر یەك پیخەف بووینەو کەسی ترمان لەلا نەبووە

رۆژیکیان شەیتان خرپە خرپ دەهاویتە دلی خیزانەکانی پیغەمبەری خوا ﷺ جا داوای ئەوەی لیدەکەن مارەییان بۆ زیاد بکا وژیانیان خۆشتر بکات ، پیغەمبەری خوا ﷺ بەم کارە دلگران دەبی ، سویند دەخوا بۆ ماوەی مانگیك نەچیتەلایان ، تاکوو سەرپشك بن

لەوەی خۆشی ژیان یان ئەم ژیانە نەبوونیەی گەل پیغەمبەری خواﷺ هەلبژێرن ، کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ یان هەلبژارد ، یەکەم مـال کـە سەری پیداگرتەوە  مالەکەی عائیشە  بوو ﷺ

چەند سالیك بەسەرچوو

پیغەمبەری خـوا ﷺ دەرچـوو لـە مەدینـە بـۆ تـەمبیکردنی جولەکەی بەنی موصتەلەق ، لەم دەرچوونە  عائیشـەی لەگـەل خۆی برد

پاش ئەوەی جەنگەکە کۆتایی پیهات بەسەر کەوتنی موسلمانان وجولەکـە گەیشـتن بـە سـزای سـتەمکاری و دووروویـی خۆیـان و دەسکەوتەکان دابـەش کـران   سـوپاکە لەسـەر ئـەم ئـاوەی کـەوا جەنگاوەرەکان ئاویـان لی دەخـواردەوە بـە یەککەیشـتن ، کیشـە لـە نیوان ئەنصاریەك و موهاجیرەك دروست بوو ، نزیك بوو ئەم کیشـەیە بیانگەیەنیت بـە پیکدادان ، ئەمـەش کـاتیك سـپلە عبداللـەی کـوری سەلول زیاتر ئاگری ئاژاوەی خۆش دەکرد و دەیگووت

( لئن رجعنا الى المدينة ليخرجن الاعز منها الاذل )

خوای گەورەش حەزی وابوو ئەم هەواله لەم کات وساتەدا بگات بە پیغەمبەری خوا ﷺ لەگەل قسەکەی کوری سەلول ، جـا حیکمـەت لەم کارە ئەوەبوو ئاژاوەکە کپ بکریتەوە وە خەلکەکە لە ئـاژاوە دور بخریتەوە کەوا فەرمانیان پیبکات یەکسەر بـە رۆیشـتن پـاش ئـەوەی ماوەیەك پشوویان دا

لەم کات وساتەدا

عائیشە ﷺ لە کەژاوەکەی هـاتبووە دەرەوە بۆ چـەند کـاریکی پیویسـت ، دوور لـە چـاوی خـەلك لـە کـاتیکدا نـەیدەزانی بـەم دوورکەوتنەوەیـە تووشـی چـی دەبیـت ، کـاتیك سـوپاکە بەریکـەوت کەژاوەکەیان بلند کردەوە سەر پشتی ووشترەکە وایان زانی عائیشـە لە ناو کەژاوەکەیە لەبەر ئەوەی ئەم کاتە دایکی بروادارانی عائیشە  بە تەمەن بچووك بوو لەشی سووك بوو ، موسـلمانان ریگـای مەدینـەیان گرتەبەر .

کاتیك عائیشە  گەرایەوە لای کەژاوەکەی ملوانکەکـەی ملـی لـە ملیدا پسابوو ، لەبەر ئەوە گەرایەوە بۆ دۆزینەوەی ملوانکەکەی

جا ملوانکەکەی دۆزیەوە پاش ئەوەی سوپاکە رۆیشتبوو ودوورکەوتبۆوە ، گەرایەوە شوینی سەربازگەکە کەس نەمابوو ، جالە شوینی خۆی دانیشت لەو شوینەی لیی دابەزیبوو ، ئەوەبوو پالی دایەوە وای زانی ئەوان دەگەرینەوە دوای

جالەم کاتەی دانیشتبوو خەو بردیەوە و خەوی لیکەوت ، هەروەها صفوان کوری موعەطەل ﷺ ( کەوا یاوەریکی بەریزو موسلمان وپاك وبە غیرەت بوو هەموو جەنگەکانی بینیبوو لە کۆتاییدا بە شەهیدی سەری نایەوە ) ئەم یاوەرە پیغەمبەری خوا ﷺ تایبەتی کردبوو کەوا لەدوای سوپا بروات ، هەر کەلوپەلیکیان لیکەوتبا ئەوا هەلیدەگرتەوە ، لەبەر ئەوە ئەم یاوەرە بەریزە بۆ ئەم کارە تایبەتمەندکرابوو چونکە ئەم یاوەرە خەوی گرانبوو ، سیفەتیك بووبەدەست خۆی نەبوو لەخەودا دەمایەوە

جائەم یاوەرە بەریزە لە دوورەوە بینی رەشایی مرۆڤیك دیارە وا نووستووە هاتەلای وبینی وا خۆی داپۆشیوە ( لەبەر ئەوەی ئایەتی حیجاب سالی پینجەمی کۆچی دابەزی ) جابۆ دواوە گەرایەوەو گووتی

( اناالله و انا اليه راجعون ).

بۆئەوەی بەئاگا بیت و بیگەرینتەوە ، ئەوەبوو وشترەکەی لی نزیك کردەوەو گووتی

ئەی دایکە هەلسەو سواربە ، ئەویش جلەوی وشترەکەی گرتبوو ، دەستی بە رۆیشتن کرد تاکو بۆ نیوەرۆ بە سوپاکە گەیشتەوە

ئەم رووداوە بووە قسەی سەرزمان و گەیشت بە کوری سەلولی دووروو سپلە ، ئەمەش بۆ ئەو دەرفەتیك بوو نەیدەویست لە دەست خۆی بدات ، بۆیە دەرفەتی گووتی وگووتیان ( قیل وقال ) ی هەلقۆستەوەو زمانە ژەهراویەکەی خستەکار سەبارەت بە رووداوی ( افك ) بۆ ئەوەی نیوانی پیغەمبەری خوا ﷺ و نزیکترین هاوریی ئەبوبەکر ﷺ تیك بدات و گومان بخاتە ناموس و ریزی پیغەمبەرەکەمان ﷺ

دایکە عائیشە لەهەندیك لەوانەی لیی ریوایەت کراوەدەلیت

گەیشتینەوە مەدینە مانگیك نەخۆش کەوتم ، خەلکیش لەم دەم بۆ ئەو دەم باسی مەسەلەی (افك ) یان دەکرد ، هەوال گەیشتە

پیغەمبەری خوا ﷺ و دایك وباوكی ، ئەویش هیچ شتیكی لەمبارەیەوە نەدەزانی ، گومانیشم برد پیغەمبەری خـوا ﷺ بـەزەیی بەرامبـەر مـن نەماوە لە كاتیكدا نەخۆش بووم ، دەهاتە ژوورەوەو سەلامی دەكرد و دایكم لەلام بوو خزمەتی دەكردم پاشان دەیفەرموو :

﴿ كيف تيكم ﴾ ؟

واتە كچۆلەتان چۆنە ؟

پاشان لەلام دەرۆیشت وئەوەش گومانی دەخستە دلـم ، تـاكوو دەرچووم ، پاش ئەوەی چاك بوومەوە ( ام مسطح ) كەوا كچی خالی ئەبوبەكر بوو لەگەلم دەرچوو

ام مسطح ساتمەی كرد لە خرخالەكەی و

جاگووتی داماوبیت مسطح

عائیشە پیی گووت :

قسەیەكی خراپت كـرد ، ئایـا قسـە بـە پیـاویك دەلییـت بـەدری بینیوە ؟

گووتی ئەی خزمە ئایا گوییبیست نەبووی چی گووتووە ؟

گووتم : چی گووتووە ؟

جاهەوالی مەسەلەی ( افك)ی دامـی ، ئـەوەبوو نەخۆشـیەكی‌تر لەسەر نەخۆشیەكەم زیادی كرد ، گەرامەوە مالەوە ئەم شەوە بەیانیم كردەوە بی ئەوەی فرمیسكم رابوەستی وچاوم بچیتە خەوەوە

پاشان پیغەمبەری خوا ﷺ هاتەلام وپاش سەلام كردن فەرمووی:

ئایا كچەكەتان چۆنە ؟

جاداوای ریگاپیدانی كرد بیتە مـالی بـاوكم و منیـش دەمویسـت ئەم هەواله لەلایەن ئەوانەوە بە دلنیایی‌یەوە بزانم

جا پیغەمبەری خوا ﷺ ریگای پیدام بچمە مـالی بـاوكم ، كـاتیك چوومە ژوورەوە بینیم ( ام رومـان ) لـە خوارەوەیـە و ئەبوبـەكر لـە سەرەوە دەیخویند

جا دایكم گووتی: چۆن واهاتوویت ؟

بە دایكم گووت : خوالـە گونـاهت خـۆش بیـت ، خـەلكی باسـی مەسەلەیەك دەكەن و تۆش هیچم بۆ باس ناكەی ؟

گووتی   ئەی کچم لەسەرەخۆبە . سویندبەخوا کەم ئافرەت هەیە لەلای پیاویك بیت وخۆشی بویت وهەویشی هەبیت ئەوا قسەشی لەسەر نەکریت !!

جا پەندی وەرگرت و گریا ، ئەبوبەکر گویی لەدەنگی بوو ودابەزی بە دایکمی گووت :

ئەمە چیەتی ؟

گووتی

ئەمەی پیگەیشتووە کەوا باسی لیوە دەکەن ، جا ئیمامی ئەبوبەکریش چاوەکانی پرگریان بوو ، ئەم شەوەو شەوەکەی تر بەشم هەر گریان بوو ، دایك وباوکم لەلام بوون ئەوان لەم بروایەبوون جەرگم بتەقیت بەهۆی ئەم گریانەوە

کاتیك من لەم حالەتەبووم پیغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان وسەلامی کردوپاشان دانیشت ، شاهیدی هیناو فەرمووی :

لەپاشان ئەی عائیشە   قسەیەکی ئاوهاوئاوهام پیگەیشتووە ، ئەگەر هاتوو بی تاوان بیت ، خوا بی تاوانیت لی وەرگریت ، وەئەگەر گوناهباریت تۆبە بکەو پەشیمان ببەوە ، چونکە ئەگەر بەندەیەك دانی بە گوناهی خۆی هیناو پاشان داوای تۆبەی لە خوا کرد خوا لە گوناهی خۆش دەبیت .

کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لەقسەکانی تەواوبوو فرمیسکم وشك بۆوەو هەتا هەستم بەیەك دلۆپ فرمیسك نەکرد ، بەباوکم گووت

وەلامی پیغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە ، گووتی

سویندبەخوا نازانم چی بلیم ؟

بە دایکم گووت : وەلامی بدەرەوە ئەویش بەمجۆرەی گووت :

سویندبەخوا نازانم چی بلیم

پاشان گووتم

ئەو قسانەتان گوی لیبوو تاکوو جیگیربوو لە دەروونتان ، جائەگەر پیتان بلیم من بیتاوانم خواش دەزانی بیتاوانم ئەوا بروام پیناکەن ، وەئەگەر دان بە شتیك بهینم خواش دەزانی من بیتاوانم ئەوا بروام پیدەکەن ،جا سویند بەخوا ئەوەندە ماوە قسەکەی باوکی یوسف بلیم

( فصبر جميل والله المستعان ).

پاشان لەسەر جێگاکەم ڕاکشام و لەو گومانە نەبووم خوا نیگـام (وحی ) لەسەر دادەبەزێنیت ، من هیواخوازبووم پێغەمبەری خـوا ﷺ لە خەودا خوا بێ تاوانی منی نیشان بدات .

لەم کاتەدا ئەبوبەکر ﷺ دەیفەرموو:

نەمزانیـوە بنەماڵەیـەك لەعـەرەب وای بەسـەر هـاتبێت وەکـو ئـەوەی بەسـەرە منداهـاتووە ، سـوێندبەخوا ئـەم قسـەیان لـە جاهیلیـەتیش بـە ئێمـە نـەگووتووە کـاتێك خواشمـان نەدەپەرست ، جالەناو ئیسلام وامان پێ دەڵێن ! !

جا پێغەمبـەری خـوا ﷺ نیگـای بـۆ دابـەزی ، بالیفیکی لـەژێر سەری خۆی دانا

کاتێـك نیگاکـە تـەواو بـوو پێغەمبـەری خـوا ﷺ زەردەخەنـەی دەبردەوەو ئارەقـەی لـە نیوچـەوانی پـیرۆزی دەسـڕیەوە ، ئـەوەبوو یەکەم ووشەی قسەی پێکرد :

**﴿ يا عائشة اما أن الله قد برأك ﴾.**

واتە: ئەی عائیشە خوا بەبێ تاوانی دەرهێنای .

جادایکم گووتی: بڕۆ لای

گووتم: سوێندبە خوا ناچمەلای و سوپاسی خوادەکەم کەوا بەبێ تاوانی دەرهێنام .

لـێرەدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ ماوەیـەك ژیـانی بردەسـەر زۆر بـە ناخۆشی و نەیدەزانی چی بکات .

ڕاوێژی بە یاوەرەکان کرد ئیمامی عومەر بە شێوەیەکی دلنیـایی گووتی

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کی ئەم ژنەی بۆ هێنایت ؟

فەرمووی خوای گەورە

گووتی : ئایا گومان دەبەیت خوا لێتــی تێـك بـدات ؟ پـاك وتـە مێزی بۆ خوا ئەمە بوختانێکی گەورەیە

بانگی عەلی و ئوسامەی کـوری زەیـدی کـرد و ڕاوێـژی پێکـردن دەربارەیجیابوونەوە لە خێزانی

ئوسـامە گووتـی: خێزانەکـەت ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ تەنـها خێرمان لێی بیستووە

ئیمامی عەلیش گووتی: ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ، خوا لەسەرت تەسك ناكاتەوە و ئافرەتیش بیجگە لە ئەم زۆرن ، وە ئەگەر پرسیار لە جاریەكەی واتە ( بریره ) بكەیت بەراستی وەلامت دەداتەوە ، ئەویش بانگی كردو پرسیاری لیكرد

ئەی ( بریره ) ئایا شتیكت لیی بینیوە گومانی پی ببەیت ؟

ئەویش گووتی بەم خوایەی تۆی بە هەق ناردووە من شتیكم لیی نەبینیوە ، ئەوە نەبیت ئافرەتیكی تەمەن بچووكە و لەسەر هەویرەكەی خەوی لی دەكەویت جامریشك دین هەویرەكەی دەخۆن

هەروەها پرسیاری لە زەینەبی كچی جەحش كرد كەوا خۆشەویستترینی خیزانەكانی بوو پاش عائیشە ، ئەویش گووتی

چاووگویم دەپاریزم ، بیجگە لە خیر هیچی ترم لیی نەبیستووە ، سویند بەخوا قسەیەك ناكەم تەنها ئەگەر قسەی هەق نەبیت

لەم كاتانەدا پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر ئازاری خوارد بە مەسەلەی ( افك ) جاووتاری بۆ موسلمانان داو فەرمووی

ئەی خەلكینە ، ئەم پیاوانە بۆچی ئازارم دەدەن و قسەی ناهەق لەسەر كەسوكارم دەكەن ؟!!

ئوسەیدی كوری حوزەیر گووتی :

ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەو كەسە ئەگەر لە ئەوسە ئەوا بۆ ئیمەی بەجیبهیلە ، وە ئەگەر لە برایەكانمان لە خەزرەجە جا فەرمان بكە تا فەرمانەكانت بەجی بهینن ، جا سویند بەخوا ئەوانە جیگای خۆیەتی لە ملیان بدەیت

سەعدی كوری عوبادە پەلاماری بۆ هیناو هاواری كرد و گووتی: درۆت كرد ،بەخوا لە ملیان نادەیت ، بەلام سویندبەخوا ئەم قسەت نەدەكرد تەنها ئەوە نەبیت كە دەزانیت ئەمە لە خەزرەجە ، ئەگەر لە هۆزەكەی خۆت بوایە ئەمەت نەدەگووت

ئوسەید كوری حوزەیر بەمە زۆر خەمگین بوو ، خەلك كۆمەلەیان كرد ئەگەر پیغەمبەری خوا ﷺ بە گەورەیی خۆی نەگەیشتبا ئەوا ئاژاوە تەشەنەی دەكردو گەورە دەبوو .

ئەمەش كورتەی مەسەلەی ( افك ) بوو لەگەل خالە گرنگەكانی ، خوای گەورە ش لەبی تاوانی عائیشەی دایكمان ﵂ دەفەرمویت

﴿ إن الذين جاؤوا بالإفك عصبة منكم لا تحسبوه شرا لكم بل هوخير لكم لكل امرئ منهم ما اكتسب من الإثم والذي تولى كبره منهم له عذاب عظيم {١١} لولا إذ سمعتموه ظن المؤمنون والمؤمنات بأنفسهم خيرا وقالوا هذا إفك مبين {١٢} لولاجاؤوا عليه بأربعة شهداء فإذ لم يأتوا بالشهداء فأولئك عند الله هم الكاذبون {١٣} ولولا فضل الله عليكم ورحمته في الدنيا والآخرة لمسكم في ما أفضتم فيه عذاب عظيم {١٤} إذ تلقونه بألسنتكم وتقولون بأفواهكم ما ليس لكم به علم وتحسبونه هينا وهو عند الله عظيم {١٥} ولولا إذ سمعتموه قلتم ما يكون لنا أن نتكلم بهذا سبحانك هذا بهتان عظيم{١٦} يعظكم الله أن تعودوا لمثله أبدا إن كنتم مؤمنين {١٧}ويبين الله لكم الآيات والله عليم حكيم {١٨} إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا لهم عذاب أليم في الدنيا والآخرة والله يعلم وأنتم لا تعلمون {١٩} ولولافضل الله عليكم ورحمته وأن الله رؤوف رحيم {٢٠ ﴾

بەمجۆرە جاریکی تر خۆشەویستی عائیشەبۆ پیغەمبەری خواﷺ گەرایەوە ، سپلەو دووروانیش بە سزای خۆیان گەیشتن .

کاتیك پیغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی مالئاوایی گەرایەوە ئەم ئایەتەی خویندەوە :

(( اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام دينا ))

چاوەکانی ئەبوبەکری صدیق ﷺ فرمیسکی لی هاتنە خوارەوە چونکە هەستی کرد بە نزیك بوونەوەی کۆچی دوایی پیغەمبەری خوا ﷺ

کاتیك تایەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ لەزیاد بووندابوو ، جاداوای روخسەتی لە خیزانەکانی کرد ریگای پی بدەن لە مالی عائیشە بمینیتەوە

لەبەر ئەوەی عائیشەی ﷺ لە هەموو خیزانەکانی زیاتر هەلدەستا بە چاودیری کردنی و هەردووکیان بۆ یەکتر زیاتر بەوەفابوون

هەروەها پیغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی کرد لەماڵەکەی ئەو بە خاك بسپیردریت ، عائیشه ﷺ لە هەموو خیزانەکانی زیاتر خەمی خوارد بە ماڵئاوایی پیغەمبەری خوا ﷺ ، ئەو رۆژانەی بە یاد دەهاتەوە کەوا لەمەوپیش لەگەڵی بەسەر بردبوو .

عائیشه ﷺ سەرچاوەی هەموو فەرموودەو ئەو فیقهە ئیسلامیانە بوو کە پەیوەندی بە ئافرەتان هەبوو .

عائیشه لەدوای ماڵئاوایی پیغەمبەری خوایش ﷺ لە لایەن هەر چوار خەلیفەکانەوە ریزیکی تایبەتی لیدەگیرا

تاکوو عائشەی دایکمان ﷺ نەخۆش کەوت ، رۆژ بە رۆژ نەخۆشیەکەی توندتر دەبوو ، تاکوو گیانی پاکی بەرز بۆوە بۆ ئاسمان و بە هیوای گەیشتنی پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشت و لە بەقیع بە خاك سپیردرا ، ئەبوو هورەیرە ﷺ یەکیك بو لەوانەی ئامادە بوو لە بە خاك سپاردنی لە ریگای بەقیع ، کاتیك چاوەکانی پربوو لە فرمیسك دەیگووت: رەحمەتی خوا لە دایکی بڕواداران عائیشه

بەراستی ژیانی لاپەرەیەکی سپی بیگەردبوو ، تاکوو بلیی پاك بوو

لە کۆتاییدا لە خوا دەپاریینەوە ئافرەتانی بڕوادار لە دەست وزمانی سپلەو بی باوەران بپاریزیت ، ئافرەتانی ئیمەش دایکە عائیشە بکەن بە سەرمەشق لە داوین پاکی و زانست دۆستی ، هەروەها خوا رووی ئەو کەسانەش رەش بکات کەوا زمانی گلاویان بە کار دەخەن دژی ئەم یاوەرە پاکە بیگەردانە کەوا خوای گەورە شاهیدی پاکی وبی گەردی بۆ داون

**رەزای خودا لە دایکی بەریزمان دایکە عائیشەی خۆشەویستی پیغەمبەری خوا ﷺ و کچی یاوەری بەریزی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر ی صددیق ﷺ وخوشکی یاوەری دووپشتین ئەسمای خیزانی زوبەیری کوری عەوام**

# (١١٣)

# خوزەیمەی کوری ثابت

## شەهیدی خاوەن دوو شاهید

## ﴿١١٣﴾
## خوزەیمەی کوری ثابت
## * شەهیدی خاوەن دوو شاهید *

لەبەر ئەوەی دەروونی بروادار سروشتیکی جوانی خوای گەورەیە ، جاوا لە خاوەنەکەی دەکات ریگای راست وروون لە ژیانی بگریتە بەر ، هەر کردەوەیەك جوان و چاك وریك وپیك بیت ئەوا وەری دەگریت ، وە هەرچی کردەوەیەك ناشیرین وناریك بیت ئەوا بیزی لی دەکاتەوە ، واتە ئەگەر هەقی بینی ئەوا باوەشی پیا دەکاو ئەگەر ناهەقیشی بینی بەرەنگاری دەبیتەوە و دژی دەوەستیت

هەر لەم رۆژەی خوای گەورە روناکی خۆی دابەزاندە سەر زەوی و دلی پیغەمبەرەکەی ﷺ خۆی پی رۆشن کردەوە ، بۆ ئەوەی ببیت بە هەلگری پەیامەکەی وبە خەلکی ئادەمیزادوجنۆکەی رابگەیەنیت ، لیرەدا کۆمەلیك لە دروستکراوەکانی کەوا باشترین و هەلبژاردەی ئادەمیزاد بوون ، بەپیر بانگەکەی ئەم پیغەمبەرە ﷺ راستگۆیەوە هاتن و بوون بە حەواری وسەرخەری لەبەر ئەوەی بنچینەی ئەم مرۆڤانە رەسەن بوو بۆ هاتنە سەر ریگاو بە پیرەوە هاتن ، جا ئەمانە بوون بە گیانفیداو موجاهید لە ریگای ئیسلام ، لەکاتی ئاشتەوایی هەروەکو فریشتە بوون ، وەکو کافورو ئەلماس لە نیو خەلکدا دەسورانەوە و دەبریسکانەوە ، لە کاتی جەنگیش قارەمان بوون و داستانیان بەسەر دوژمنان و ستەمکاران تۆمار دەکرد

ئەوانە وەکو ئەوە بوون کە خوای گەورە دەرهەقیان فەرموویەتی

(( أشداء على الكفار رحماء بينهم ))

وە یان دەفەرمویت :

(( أذلة على المؤمنين ، أعزة على الكافرين ))

نموونەی یەکیك لەم یاوەرە تیکۆشەرە بەریزانە، بروادارى موجاهید ، باوکی عمارە خوزەیمەی کوری ثابیتی کوری عمارەی کوری فاکهی کوری سەعلەبەی ئەنصاریە ، ئەم پیاوە یەکیك بوو لە

ناودارەکانی ئەوس لە جاهیلیەت و ئیسلام و یەکیك بوو لە پیاوە ئازا پیش چاوەکان ، ئیسلامیش بەم سیفەتانە رازاندیەوە

لە دەستپاکی و راستگۆیی و رەوانبیژی ، جاهۆزی ئەوس شانازیان دەکرد بە چوار قارەمانیان ، یەکیك لەوان حەنزەلەی دونیا نەویستی شۆردراو لە لایەن فریشتەکان ، هەروەها عاصم کوری ئەفلەح کەوا زەردەوالە لاشەکەیان پاراست ، لە گەل خاوەنی دووشاهید خوزەیمەی کوری سابیت و سەعدی کوری موعاذ کاتیك عەرشی‌خوا بە مردنی کەوتە لەرزە

خوزەیمە ﷺ نازناوی دوو شاهیدی لینرابوو لەبەر ئەوەی ئامادەبوو کاتیك گفتووگۆیەك لە نیوان پیغەمبەرو ﷺ خەلکانیك روویدا سەبارەت بەقەرزیك کە لەسەر پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ، ئەویش قەرزەکەی دابۆوە ، خوزەیمە بەبی ئاگایی گوتی

شاهیدی دەدەم ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ کەوا تۆ قەرزەکەت رەت کردۆتەوە

پیغەمبەری خوا ﷺ پیی فەرموو :

**﴿ کیف تشهد ولم تحضره ولم تعلمه ﴾؟!**

واتە : چۆن شاهیدی دەدەیت لە کاتیکدا تۆ نە ئامادە بووی و نە ئاگاداری ؟!

خوزەیمە گوتی

ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ، ئیمەبروامان پیت هیناوەبەنیگا لە ئاسمان ،جاچۆن بروات پی‌ناهینین قەرزەکەت رەت کردۆتەوە ؟!

لیرەدا راستگۆی دەستپاك ﷺ زۆر سەری سورما لەم ئیمانە بە تینە و ئەم گومانە بە هیزەی خوزەیمە ، جا ئەم نازناوە مەزنەی بەسەردا بەخشرا (ذوالشهادتین )

واتە : خاوەن دوو شاهید

هەروەك ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا ریوایەت دەکات لە زەیدی کوری ثابیت کە پیغەمبەری خوا ﷺ شاهیدی خوزەیمەی کردووە بە دوو شاهیدی دوو پیاو .

ئیتر بەمجۆرە پیغەمبەری خوا ﷺ ریزی دەنا لە یاوەرە دلسۆزەکانی کەوا ببوون بە سەرمەشقی یەقین و ئیمان بۆ موسلمانان.

خوزەیمە پیاویکی ژیرو بیر تیژ بوو ، لەبەر ئەوە لەسەرەتای ریگای برواهینانی دەیزانی ئەم بتانەی کەوا نەفامەکان دەیپەرستن لە میللەتەکەی نە قازانجیان هەیەو نە زیان ، بۆ مرۆڤی ژیریش رەوا نیە نە بە گەورەیان بزانی و نە گرنگیان پی بدا ، لەبەر ئەوە خوزەیمە بە کردەوە دژایەتی بت پەرستی دەکرد ، ئەوەبوو لەگەل عومەیری کوری عەدی هەر کاتیك دەرفەتی بۆ دەرەخسا دەردەچوو بۆ سەرنگووم کردن و شکاندنی بتەکان تاکوو نەفامە بتپەرستەکان لەم ریگا وون بونەیان بە ئاگا بینەوە ، عەقلیان بیتەوە سەرەخۆ کاتیك ببینن خواکانیان شکاوەوناتوانن بەرگری زیان و خراپە لە خۆیان بکەن

لیرەشدا کردەوەی دۆستی خواو باوکی پیغەمبەران ئیبراهیممان بە یاددا دینیتەوە ﷺ کاتیك بتەکانی میللەتەکەی دەشکاند بۆ ئەوەی ئاوریك لە عەقلی خۆیان بدەنەوە لە ریگای تاقیکردنەوەی بینایی بۆ ئەو بیرکردنەوە خراپەیان و چارەنووسە خراپەیان ، خوای گەورەش لە سورەتی ( ألانبیاء ) لەم چەند ئایەتە ئەم دیمەنەمان دینیتە پیش چاو کە دەفەرمویت

﴿ ولقد آتينا إبراهيم رشده من قبل وكنابه عـالمين {٥١} إذ قال لأبيه وقومه ما هذه التماثيل التي أنتم لها عاكفون {٥٢} قالوا وجدنا آباءنا لها عابدين {٥٣} قال لقد كنتم أنتم وآباؤكم في ضلال مبين {٥٤} قالوا أجئتنا بالحق أم أنت من اللاعبين {٥٥} قال بل ربكم رب السماوات والأرض الذي فطرهن وأنا على ذلكم من الشاهدين {٥٦} وتالله لأكيدن أصنامكم بعد أن تولوا مدبرين {٥٧}فجعلهم جذاذا إلا كبيرا لهم لعلهم إليه يرجعون {٥٨} قالوا من فعل هذا بآلهتنا إنه لمن الظالمين {٥٩}قالوا سمعنا فتى يذكرهم يقال له إبراهيم {٦٠} قالوا فأتوا به على أعين الناس لعلهم يشهدون {٦١} قالوا أأنت فعلت هذا بآلهتنا يا إبراهيم {٦٢} قال بل فعله كبيرهم هذا فاسألوهم إن كانوا ينطقون {٦٣} فرجعوا إلىأنفسهم فقالوا إنكم أنتم الظالمون {٦٤} ثم نكسوا على رؤوسهم لقد علمت ما هؤلاء ينطقون {٦٥} قال أفتعبدون من دون الله ما لا ينفعكم شيئا ولا يضركم {٦٦} أف لكم ولما تعبدون من دون الله أفلا تعقلون {٦٧}﴾

خوزەیمە ﷺ بە بیگومان ودودلی دەیزانی گەیشتن بە ئیمان پیویستی بە ماندوو بون و ئەرك هەیە ، وە سەركەوتنی مرۆڤ بە خۆشی نەبراوەی پەروەردگار بیگومان دەبیت بروادار نرخی بۆ بدات لە مال و دەروونی ، لەبەر ئەوە هەردەم ئەم فەرمودەیەی پیغەمبەری خوای ﷺ دووبارە دەكردەوە

**﴿ ان الجنة محظور عليها بالدآ ليل ﴾.**

واتە : بەراستی بەهەشت دەورە دراوە بە بەلا و ناخۆشی

واتە هەر كەسیك بەهەشتی بویت ئەوا بیگومان دەبیت هەنگاوی ناخۆشی وتالی بۆبهاویت ، هەروەك پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت

**﴿ حفة الجنة بالمكاره ،وحفت النار بالشهوات ﴾...**

واتە : ﴿ بەهەشت دەرە دراوە بە ناخۆشی و دۆزەخیش دەورەدراوە بە ئارەزوو و خۆشی ﴾

هەروەها پەندیكی عەرەبیش هەیە دەلی

( لابد دون الشهد من ابر النحل )

واتە : بیگومان ئەوەی دەست بۆ شانەی میش هەنگوین ببات ، دەبیت میش هەنگوین پیی وەبدات

۞ ۞ ۞

لەبەر ئەوە خوزەیمەی خاوەن دوو شاهید بەردەوام بوو لەسەر ریگای تیكۆشان وخۆ بە قوربانیدان ، جاجەنگی بەدری بینی لەگەل هەموو جەنگ و دیمانەكانی تر ، هەروەها هەلگری ئالای تیرەكەی (بنی خطمة ) بوو لە هۆزی ئەوس لە جەنگی فەتحی مەككەدا ، ئەم جەنگەش جەنگیكی پیرۆز و بەبەرەكەت بوو ، پاشان ئایەتی خوای گەورەی لەسەردابەزی كەدەفەرمویت

﴿ اذا جاء نصر الله والفتح ورأيت الناس يدخلون في دين الله أفواجا فسبح بحمد ربك واستغفره انه كان توابا ﴾.

دونیا بەچەند دۆخیك دا رۆیشت و چەند سالیكی بەسەردا چوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە پەروەردگاری ، چەند دەرگایەكی تیكۆشان و ململانی بەرامبەر موسلمانان دەرگای لەسەرخۆ والا كرد ، لیرەدا خوزەیمەی خاوەن دوو شاهید چەسپاو بوو لە ریگای هەق

وهیدایەت ، پالی دا بە ریزی عەلی کوری ئەبی طالب ﷺ زۆر دلسۆز بوو بۆی وراستگۆو بەوەفا بوو لە دژایەتی ستەم و زۆرداری و لە هەق لادان .

لەسالی سی ونۆی کۆچی خوزەیمەی خاوەن دووشاهید لەگەل ئیمامی عەلی دەرچوو بۆ جەنگی ( صفین ) ،کاتیك بینی دەستەی ریگا بزرکەرەکان شەهیدی ستەملیکراو عەمماری کوری یاسریان شەهید کرد ﷺ ، لیرەدا خوزەیمە یەکسەر ئەم فەرمودەیەی بە یاد هاتەوە کەوا پیغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بە عەممار کرد وفەرمووی :

**﴿ یا عمار تقتلك الفئة الباغية ﴾** .

واتە : ئەی عەممار دەستەیەکی ریگا لی وونبوو دەتکوژ ن

جا خوزەیمە دلنیا بوو لەوەی ئەوانە دەستەیەکی پیاوکوژ ولە ریگالادەرن ، بیگومان دەبیت جەنگیان لەگەل بکریت ، ئەوەبوو شمشیرەکەی هەلکیشا و بەبی ترس وبەبیئەوەی گومانی لە کوشتنی ئەوانە هەبیت جەنگی لەگەل کردن تاکوو بەخششی شەهادەتی پی بەخشرا ، وە بۆ لای پەروەردگاری گەرایەوە ، یەکیك لە نەوەکانی خوزەیمە دەلیت :

( باپیرەم خوزەیمەی کوری ثابیت لە جەنگی صفین شمشیرەکەی هەر لەناو کالان بوو ، تاکوو عەمماری کوری یاسر کوژرا ، کاتیك ئەو کوژرا شمشیرەکەی دەرهیناو گووتی

گویم لە پیغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو

**﴿ تقتل عمارا الفئة الباغية ﴾** .

واتە : ﴿ عەممار چینیکی یاخی بوو دەیکوژن ﴾

جا لەم کاتەدا شەری کرد تاکوو کوژرا )

ئیمامی عەلی ﷺ زۆر خەمگین بوو بە شەهیدبوونی خوزەیمە ، لە کاتیکدا ئەم یادگارانەی بە یاد دەهاتەوە کە لە گەلی بەسەری بردبوو ، کاتیك ئیمام وەستابوو لە رۆژیکی توونـدو سامناکدا ، خوزەیمە و هاوری موجاهیدەکانی پیشووی بە یاد دەهاتەوە و دەیگووت :

( کوانی ئەو هاورییانەم کەوا کاروانیان بەری کرد و ریگای خوایان گرتەبەر ؟! کوانی عەممار ؟ کوانی ابن التيهان ؟ کوانی خاوەن دووشاهید ؟ کوانی هاوشانەکانیان لە براکانیان کەوا بەلینیان لەسەر مردن بەست ، تاکوو ئەم پیاوانە بنیرم بۆ گومراکان ) .

پاشان گووتی :

(ئاخ بۆ ئەو برایانەی کەوا قورئانیان دەخوێندەوەو فەرمانیان پێدەکرد ، فەرزەکانیان جێبەجێدەکردو پاشان دەیانچەسپاند سونەتیان زیندوو دەکردەوەو بیدعەتیان گور بە گۆر دەکرد ، بانگیان دەکردن بۆ جیهاد ئامادە بوون ، بروایان بە سەرکردەی خۆیان دەکردو شوێنکەوتەی دەبوون )

خوزەیمە ﷺ فەرموودەیەکی زۆری لە پێغەمبەری خوا ﷺ ریوایەت کردووە ، بوخاری و موسلیم سی وهەشت فەرموودەیان لێ ریوایەت کردووە ، هەروەها شاعیرێك بوو وینەو هاچەشنی نەبوو ، هەروەك لە شیعرەکانی مەدحی ئیمامی عەلی دەکات :

| | |
|---|---|
| ليس بين الانصار في حجمة الحر | ب وبين العداة الا الطعان |
| وقراع الكمات بالقضب البيـ | ـض اذا ما تحطم المران |
| فآدعها تستجب ، فليس من الخز | رج و الا وس يا علي جبان |
| يا وصي النبي ، قدأجلب الحـ | ـب الاعادي، وسارت الاظغان |
| وآستقامت لك الامور سوى الشا | م ، وفي الشام يظهر الاذعان |
| حسبهم ما رأوا ، وحسبك منا | هكذا نحن حيث كنا وكانوا |

**رەزای خودا لەسەر موجاهیدی خاوەن دوو شاهید ، خوزەیمەی کوڕی ثابیت و رەزای خودا لە ئیمامی شەهید شێری خودا ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالب**

## ﴿١١٤﴾
## زەیدی كوری ئەرقەم
### موجاهیدێكی خاوەن دوو گوێی هەستیار و راستگۆ

لە سیفەتی بروادارە كوری كات وسەردەم بێت هەروەكو پەندیكی ئیسلامی بە پێز هەیە ، جا پێویستە بە گوێرەی توانا هەلسێت بەم ئەرك و هەول و تێكۆشانە ، هەرگیز دریخی نەكات لەم هەول وتێكۆشانە بۆ بنیات نانی كۆمەلگای ئیسلامی ، ئەگەر ئەم ماندوو بوونەش بە شتێكی كەم بێت لە پاراستنی دەولەتی ئیسلامی و پاراستنی بیروباوەری ئیسلام ، جا بۆ بروادار رێگا كراوەیە بۆ ئەوەی بە قسەو كردەوە بێتە نێو ئەم مەیدانە و بەشداری بكات بە مال و روخسارە راستگۆییەكەی ، زۆر بە هەستیاری و زیرەكیەوە چاودێری بكات لە بیرو باوەر و كۆمەلەكەی لە كاتەكانی خۆ ئامادە كردن بۆ مەترسی و خۆپاراستن لە زیان وخراپە

ئەمەش بەهۆی ماندووبوون وهەول وتەقەلای هەموو بروادارێكە بۆ بنیاتنان و جێگیر كردنی دەولەتی ئیسلامی .

جابە گەیشتنی هەول و كۆششی هەموو بروادارێكی زیرەك دەولەت بنیات دەنرێ و بوونمان جێگیر دەبێت .

هەروەكوو خوای گەورەش ئاماژەی پێدەكات :

﴿ كزرع اخرج شطاه فازره فاستغلظ فاستوى على سوقه يعجب الزراع ليغيظ بهم الكفار ﴾ .

ئەمەش نموونەی موسلمانێكی هەستیارو راستگۆیە كەوا هەولی داوە بۆ چاكەو چاكە خوازی بە هەموو توانایەكیەوە ، ئەمەش یاوەری موجاهیدی تێكۆشەر :

ئەبو عامر زەیدی كوری ئەرقەمی كوری زەیدی كوری قەیسی خەزرەجی ئەنصاریە ، كەوا بەبێ باوكی لە باوەشی موجاهیدی قارەمانی شەهید عبداللەی كوری رەواحە پەروەردە بوو ، كەوا ئەم پیاوە یەكێك بوو لەم سێ سەركردانەی كەوا شەهیدكران لە جەنگی مؤتە .

جابە راستی عبداللەی کوری رەواحە باشترین پەروەردەی ئەم میردمنداڵە بیباوکەی کرد ، تاکوو زەید وایلیهات بوو بە نووسەری نیگای ( وحی ) پیغەمبەری خوا ﷺ ، وە گەورەترین پلەو پایەی وەرگرت .

زەیدی کوری ئەرقەم حەقدە غەزای لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ کرد ، جا شادەماری جیهاد لە دلی زەید بەجووڵە کەوت لە کاتیکدا گەنج بوو تازە پیدەگەیشت ، دلی بزوا بۆ ئەوەی بەشداری لە جەنگی ئوحود بکات ، بەلام ئەوکاتە تەمەنی پیرۆزی لەخوار پازدە سالیدابوو ،پیغەمبەری خوا ﷺ ریگای بەشداری پینەدا ، گەرچی پیغەمبەری خوا ﷺ لەهەمان کات ویستی ریز لە ئازایەتی زەیدی گەنجی تازە پیگەیشتوو بنیت ، جا لەگەڵ کۆمەلیك لە گەنجە هاوشانەکانی خۆی لە تیپیکی پاسەوانیدا ناردرانەوە بۆ مەدینە

بەلام هەرچی براکەی بوو : ئەوس کوری ئەرقەم لە خۆی بەتەمەنتر بوو ، ئەوەبوو بەشداری جەنگی ئوحودی کرد ، جاریزی لینرا بە بەخششی شەهادەت لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ، لیرەدا زەید بەبیبرا مایەوە هەروەك قەزا و قەدەر بۆی نووسیبوو .

کاتیکیش عبداللەی کوری رەواحە دەرچوو بۆ جەنگی (مؤتة) بۆ ئەوەی ببیت بە یەکیك لە سی سەرکردەکانی ئەم جەنگە زەیدیشی لەگەل بوو ، لەسەر ئەمە زەید دەلیت :

من بیباوکیك بووم لای کوری رەواحە ، منی لەگەل خۆی برد بۆ جەنگی مؤتة ، منی لەدوای وولاخەکەی لەپشت خۆی سوارکردبوو.

جالەم رۆژەدا گوییەکانی زەید هەستیارو راستگۆبوو بۆ ئامۆژگاریەکانی پیغەمبەری خوا ﷺ کەوا پیی ئامۆژگاری موجاهیدەکانی دەکرد ، زەید ئەم ئامۆژگاریانەی لە گوی گرت هەرچەندە قسەکان زۆربوون ، لە پیشەکی هەموویان قسەی پیغەمبەری خوا ﷺ کە دەیفەرموو :

**﴿ أوصيكم بتقوى الله وبمن معكم من المسلمين خيرا ، اغزوا باسم الله وفي سبيل الله وقاتلوا من كفر بالله ... ﴾ .**

واتە : ﴿ ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی لە خوا بترسن وە لەوەی لە موسلمانان لە گەلتانن بە چاکە لەگەلیان بجولینەوە ، جەنگ بکەن

به ناوی خوا و له ریگای خواو شەر بکەن لەگەل ئەوەی باوەر به خوا ناکات ...)

لەم جەنگە عبداللەی کوری رەواحە بەخششی شەهادەتی پی بەخشرا ، ئەم پیاوەی له جیگای باوك بوو بۆ زەیدی کوری ئەرقەم ، گەنجی بیباوك به تاك وتەنهایی گەرایەوە ، بەبی باوك وبەبی بەرپرس ، بەلام لەگەل ئەمەشدا نە کۆلیداو نە ریگای بزرکرد و نەلایدا ، چونکە خودا پشتیوانی برواداراتەو چاودیری پیاوچاکان دەکات ، هەروەها لەم رۆژگارەش کۆمەلگای ئیسلامی پاریزراو بووەو دەسەلاتی هەبووەو توانیویەتی پاریزگاری له مافی چەوساوان بکات ، بەمجۆرە زەید بەردەوام بوو له جیهادو تیکۆشان له پیناوی خوای گەورە

له جەنگی بني المصطلق کەوا دروشمی موسلمانان بریتی بوولە:
( یامنصور أمت ) ،

زەیدی کوری ئەرقەم بەشداری ئەم جەنگەی کرد ، جالەم جەنگە رووداو ویکی دلتەزین روویدا ، ئەوەبوو چەند کریگرتەکی موسلمانان قسەیان یەکتر گیر نەبوو وەلەسەر ئاو بەشەرهاتن ، جا یەکیکیان داوای فریاکەوتنی کردو گووتی :
( یا للانصار )
واتە : ( هاوار ئەی ئەنصارەکان ) .
ئەویتریان گووتی :
( یا للمهاجرین )
واتە : ( هاوار ئەی موهاجیرەکان )

نزیك بوو ئاژاوە بکەویتە نیو موسلمانان و یەکیتی نیوانیان تیك بچیت ، کەوا ئەم یەکبوونە لەسەرەوەی هەموو شتیکیان بوو ، ئەم هەواله گەیشتە پیغەمبەری خوا ﷺ جا تووره بوو به موسلمانانی فەرمووو :

**﴿ أبدعوى الجاهلية تدعون وأنا بين أظهركم؟ دعوها فانها منتنة ﴾.**

واتە : ﴿ ئایا به بانگهیژی نەزانی دا وا دەکەن له کاتیکدا من له نیوتانم ؟ وازی لی بهینن بەراستی ئەمە بۆگەنە ﴾

عبداللەی کوری سەلول ئـەم رووداوەی هەلقۆزیـەوە ، جالـە نیـو کۆمـەلیك لـە هاوریوهاوشـانەکانی دانیشـت ودەسـتی کـرد بـە تانەوتەشەرلە موسلمانان ، یەکیك لە قسەکانی ئەوەبوو گووتی:

( لئن رجعنا الى المدينة ليخرجن الاعز منها الاذل )

واتە : ( ئەگەر بگەریینەوە مەدینە دەبیت پیاوە سـەرفرازەکان پیاوە ریسواکان دەربکەن ) .

مەبەسـتی لـەم قسـەیە سـەرفرازەکە خـۆی بـوو و ریسـواکەش پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ، واتە بە هۆی ریسـوایی ئـەم پیغەمبـەرە ﷺ خۆی بە عیززەت و سەرفراز دەزانی .

بەلام هەر یەکیك ناپاکی لەگەل ئایینی خوابکات رۆژیك دیت هەر ئەم ناپاکیەی لەسەر ئاشکرا ببیت و ریسوای دونیاو قیامـەت ببیـت ، جا ناپاکی نەفرەت لیکراو ئاوری لـە پشـت خـۆی نـەدابۆوە نـەیزانی گـەنجی پـاکی دلسـۆز و بـروادار زەیـدی کـوری ئەرقـەم لـە پشـتی وەسـتاوە ، زەیـد وەکـوو بورکـان تەقیـەوەو نـەیتوانی لەسـەر ئـەم توورەیی‌یەی ئارام بگری ، بۆیە بەرەو رووی کوری سەلولی خاوەن پلە لەناو میللەتەکەی وەستا ، بە ئازایەتی و خۆراگریەوە گووتی :

( أنت والله الذليـل المنتقـص فـی قومـك ، و محمـد ﷺ فـی عـز مـن الرحمن وقوة من المسلمين ، والله لا احبك بعد كلامك هذا أبدا )

واتە : سویند بەخوا تۆ ریسوای بی‌نرخـی لـەناو میللەتەکـەت ، موحەممەد ﷺ سەرفرازە بە هۆی خـواو هـیزو بـازووی موسـلمانان ، سویند بەخوا هەرگیز لەدوای ئەم قسەیەت تۆم خۆش نەویت ).

❁ ❁ ❁

ئای لەبەر جوانی گەنجایەتی ئەم یـاوەرەی رازاندۆتـەوە بـە دل چەسپاوی و ئیمان ! !

بەراستی زەید بۆ خودا نەترسا لە لۆمەی لۆمەکاران و نەترسا لە هەق لە رەخنەی رەخنەکاران ، هەروەها نەترسا لە پلەو پایەی کوری سەلول لە نیو هۆزەکەی کـەوا گەیشـتبووە پلەیـەك نزیـك بـوو پیـش کۆچکردنی پیغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ یـەثریب ببیـت بـە پادشـای ئـەم ولاتە ، بەلکو ئەمەی پالی نا بەم گەنجە بەرامبەر ئەم ناپاکە کەلەش

گەورەو بەتەمەنە بوەستێت و ئەم کێشەی لەگەڵ بکات ، ئەو ناپاکیە بوو کەوا دڵی ئەم دووڕووەی پڕکردبوو ، وە لامی قسە نابەجێیەکانی دایەوەو بە باشترین بەرگری ، ئەوەبوو بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ، پاشان زەید بە کوڕی سەلولی گووت :

بەراستی ناتوانم هەرگیز جارێکیتر تۆم خۆش بوێت لە دوای ئەوەی ئەم قسەیەی لێ گوێ لێبوو ، جازانی بە راستی ئەمە پیاوێکی دووڕووە

لێرەدا ناپاکیەنەفرین لێکراو ترسا لە دوارۆژی ئەم قسەی کردی ، نەوەکو بگاتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بە فێل گووتیە زەید

بێدەنگ بە بەراستی من گاڵتەم کردووە

بەڵام زەید ئەمەی بە گاڵتە نەزانی و بێدەنگ نەبوو ، بەڵکوو بە پەلە ئەم قسانەی گەیاندەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، کوڕی سەلولیش یەکسەر ڕێگای ئینکاری ولاملی گرتەبەر و سوێندی خوارد قسەی وای نەکردووە ، ئەوەبوو چەند خزم وهاوڕێیەکی لە دووڕووەکان شاهیدیان بۆدا ، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیشت بە هیچ ئەنجامێك ناچاربوو چاوەڕێی قسەی نیگا ( وحی ) بکات چونکە قسە وەرگر هەمووکات تەماشای قسە کەر دەکات ، خواش پەردە لەسەر ئەم کارە هەڵدەداتەوە

جا پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لەم کارە دڵنیا بێتەوە _ هەروەك کاری قازیەکی وردبین _ بە زەیدی فەرموو :

﴿ **لعلك غضبت عليه؟** ﴾ .

واتە : ( لەوانەیە لێی تووڕە بووبێت ) .

زەیدگووتی : سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لە ئەوەبووە

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:

﴿ **لعل أخطأ سمعك ؟** ﴾.

واتە : ( لەوانەیە گوێت بەهەڵە چوبێت )

جا زەید گەڕایەوە بۆ دڵنیابوون لە هەواڵەکەی ، ئەم قسەی کردەوە

سوێند بەخوا بەراستی گوێم لە ئەوە بوو کە گووتی ، جائەگەر ئەم قسەیەم لە باوکم گوێ لێ ببێت ئەوا دەیگوازمەوە بۆ پێغەمبەری

خوا ﷺ ، وه‌ من تكام وایه‌ له‌خوا ئه‌م راستیه‌م بۆبسه‌لمینیت به‌هۆی دابه‌زاندنی نیگا بۆسه‌ر پیغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ .

ئای له‌به‌رهیزی ئه‌م بیروباوه‌ره‌، ئای له‌به‌رئه‌م ئیمانه‌به‌تینه‌ ! ...

به‌لی زه‌یدی بروادار سویند ده‌خوا به‌خوا ئه‌گه‌ر ئه‌م جویندانه‌ی به‌ پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌ باوكی گوی لی ببیت ــ له‌كاتیكدا باوكی له‌هه‌موو كه‌س زیاتر بۆ ئه‌و له‌پیشتره‌و نزیكتره‌ ــ ئه‌وا بیگومان ده‌یگه‌یه‌نیت به‌ پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ، ئه‌و پیغه‌مبه‌ره‌ی له‌ هه‌موو كه‌س زیاتر خۆشی ده‌ویت وبه‌وی بیت ئازار به‌ باوكی بگات به‌لام دركیك له‌ پیی پیغه‌مبه‌ره‌ خۆشه‌ویسته‌كه‌ی ﷺ رانه‌چیت ، جامافی خوداو بیروباوه‌ره‌كه‌ی له‌ پیشه‌وه‌ی هه‌موو شتیكه‌

لیره‌دا زه‌ید زۆر خه‌مبار بوو له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شتیكی نه‌بینیه‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی راستیه‌كه‌ی پی بسه‌لمینیت ، هه‌تا خۆی ئه‌م خه‌مه‌ی باس ده‌كات و ده‌لیت

خه‌میكی وام به‌سه‌ردا كه‌وتبوو هه‌رگیز شتی وا به‌سه‌ر كه‌سدا نه‌كه‌وتبوو ، هه‌روه‌ها ده‌لیت :

خه‌میكم تووش بوو هه‌رگیز له‌مه‌وبه‌ر شتی وام به‌سه‌ردا نه‌هاتبوو ، جا له‌ ماله‌وه‌ دانیشتم .

جا خوای دادوه‌ری دادوه‌ران و فه‌رمانده‌ری فه‌رمانده‌ران به‌راستی زه‌ید له‌یاد ناكات وناهیلیت زه‌ید له‌مالدا بكه‌ویت و خه‌م وپه‌ژاره‌ دلی دابگریت ، به‌لكوو تكاكه‌ی وه‌رگرت و نزاكه‌ی گیرا كرد ، هه‌قی به‌ دیار خست و ناهه‌قیشی ریسوا كرد ، پاش كه‌میك سوره‌تی ( المنافقون ) ی له‌سه‌ر پیغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ دابه‌زاند كه‌ تیایدا دووروو ناپاكان ریسوا ده‌كاو نیازه‌ گلاوه‌كانیان به‌ دیار ده‌خا و ئابرووی كوری سه‌لولی ناپاك ده‌بات ، له‌سه‌ره‌تای سوره‌ته‌كه‌ سروشتی ناپاكی له‌سه‌ر ئاستی فرت وفیل و درۆو ترس وتیكدانی دل و ده‌روون ئاشكرا ده‌كات ، جا خوای گه‌وره‌ له‌م سوره‌ته‌ قسه‌ له‌گه‌ل پیغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌كاو ئه‌ویش یاوه‌ره‌كان كۆده‌كاته‌وه‌ و سوره‌ تی ( المنافقون ) یان بۆ ده‌خوینیته‌وه‌ ، هه‌روه‌كو بلییت خوای گه‌وره‌ زه‌یدی كوری ئه‌رقه‌م ده‌كاته‌ هۆی چاكه‌و چاكه‌خوازی ، جا سه‌باره‌ت به‌م چیرۆكه‌ی ئه‌و ، ئه‌م ئایه‌ته‌ داده‌به‌زینی ، كه‌وا تاكوو ئیستا بۆ جیاكردنه‌وه‌ی هه‌ق و ناهه‌ق به‌كار ده‌هینریت

سیره دەگێڕیتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەم راستگۆییەی زەید ، بە زەیدی فەرموو :

**﴿ ان الله قد صدقك، وفت أذنك، وصدق الله حديثك ﴾ .**

واتە:﴿ بەراستی خوا بەراستگۆی دەرهێنای ، وە گوێیەکانی کردی بە دابینکاری راستی ، وە خوا قسەکەتی بە راست دانا ﴾.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموویت :

**﴿ وعت أذنك يا غلام، وصدق الله حديثك، وكذب المنافقين ﴾.**

واتە : ﴿ ئەی گەنج گوێیەکانت راستیان کرد ، وە خوا قسەکەتی بە راست دەرهێنا ، وە دووڕووانی بە درۆ خستەوە ﴾

وە لە ریوایەتێکی تردا دەفەرمویت :

**﴿ ان الله قد أنزل عذرك و صدقك ﴾.**

واتە ﴿ بە راستی خوا پاساوی بۆ دابەزاندی و بە راستی دەرهێنای ﴾

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە یاوەرەکانی فەرموو و ئاماژەی بۆ زەیدی کوری ئەرقەم دەکرد :

**﴿ هذا الذي أوفى الله بأذنه ﴾.**

واتە : ﴿ خوا راستیەکانی دەرخست سەبارەت بەوەی گوێیەکانی بیستی ﴾

لەبەر ئەوە موسلمانان بە زەیدیان دەگووت :

( ذو الاذن الواعية ) .

واتە : ( خاوەن گوێی هەستیاری راستگۆ )

لێرەدا ئایەتی خوایان بەیاد دەهاتەوە لە سورەتی الحاقە:

﴿ لنجعلها لكم تذكرة وتعيها أذن واعية ﴾.

لێرەدا زەید تەنها نەوەستا بە جیهادی گۆڕەپان و دژایەتی ناهەق ، بەلکو ئەوەندەی لە توانا هەبوو جیهادی زانست و شارەزابوون لە ئایینی کرد ،جا دەیەها فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێرایەوە ، ئەوەبوو چەندەها زانای گەورە و بەناوبانگ فەرموودەیان لە دەمی گێراوەتەوە ، نموونەی ئەمانە ئەنەس کوری مالیك و عبداللەی کوری عەبباس ، جائەم دوو نموونەیەش بەسە بۆ گەورەیی و پلەو پایەی ئەم یاوەرە بەرێزە ، ئەمەش کاری خوای

گەورەیە ئەم دوو زانستە لــە یـاوەری موجـاهیدی خـاوەن دوو گـویـی هەستیاری راستگۆ وەربگیریت کەوا بە بیباوکی پەروەردە بـوو ، بـە موجاهیدی ژیا

هەروەها چەند تابعینەکیش فەرموودەیان لیی گیراوەتەوە

جا ژیانی زەیدی کوری ئەرقەم دریژبۆوە یەك سات دوانەکەوت لە جەنگیك لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ هەتا لە حەڤدە جـەنگان لـە گـەل پیغەمبەری خوا ﷺ جەنگا ، زۆر جاران دەکەوتە شوینی مەترسـیدارو ترسناك ، جانەدەکوژراو نە برینداریش دەبوو ، ئـەو زەیـدەی لـە زۆر شوینان داوای مردنی دەکرد بەلام مردن لە بەری هەلدەهات

بە ئەنقەست خۆی دەخستە شوینی مەترسـیدار لـە ریگـای خـوا بەلام مەترسی باوەشـی پیـا نـەدەکرد ، هـەر لـە ژیـر چـاودیری خـوا مایەوە

کاتیك زەید بە سالاچوو لە کۆتایی ژیانی چاوەکانی لــە دەسـت دا ، زەید واینەکرد بەشی لە چاکەو خیر ببریت بەلکو وەکوو موفتیەك هەلسا فتـوای بـۆ خـەلك دەدا و کاروبـاری ئـایینی فـیردەکردن ، جـا ئەوەبوو تەمەنی پرخیرو بەرەکەتی زەید هــەر هـەمووی لـە جیهاد و چاکەی ئیسلام بـەختکرا ویـەك سـات لـە تەمـەنی پـیرۆزی بـە فـیرۆ نەچوو ، تاکوو لەلایـەن پـەروەردگار دەفتـەرەکانی چاکـەی پربـوو ، کاتی ئەوە هـات دونیـای فـانی بـە جـی بـهیلی وبـۆ لای پـەروەردگار بگەریتەوە و بـە پیغەمبـەر ﷺ و یـاوەرە بـەریزەکان شـاد ببیتـەوە ، ئەوەبوو لە شاری کووفـە لـە سـالی پەنجاوشەشـی کۆچـی مالئـاوایی کرد.

**خوای گەورە لە یاوەری دلسۆز و هەگبە پر لەخیرو بەرەکەت رازی بیت و وابکات ئیمەش تەنها دەم وگویمان بۆ گووتن و بیستنی هەق بەکاربهینین .**

# (١١٥)
# سەعدی کوری عوبەیدی ئەنصاری
## قورئان خوێنی شەهید

یەکێك لەو راستیە نەگۆرانە لە لایەن هەموو بروادارێکی ژێر ئەوەیە کەوا مەزنترین دیاری بە هۆی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ رەوانە کرابێ بۆ بەندەکانی ، کەوا کتابێکی بۆ رەوانە کردوون هیدایەت و روناکی تیایە ، جائەم کیتابە بووە بە بەلگە بۆ سەرکەوتن لەدونیاو پێشەنگ بۆ سەرکەوتن لە ئاخیرەت ، خوای گەورەش راستی فەرمووە کە دەفەرموێت :

﴿ ان هذا القرآن يهدى للتى هى أقوم ﴾ .

هەروەها دەفەرموێت :

﴿ قد جاءكم من الله نور وكتاب مبين ، يهدى به الله من اتبع رضوانه سبل السلام ، ويخرجهم من الظلمات الى النور باذنه ، ويهديهم الى صراط مستقيم ﴾ .

ئەگەر هاتوو ئەم قورئانە پیرۆزە بنچینەکانی بیروباوەر وعیبادات و موعامەلات بگریتەوە ، هەروەها بەراستی بەزەیی فرەوان و هێزی ئاشکراش بەیەکتری کۆ دەکاتەوە ، جا جارێکیان بەزەیی ونەرمی دەنوێنێت هەروەکو دەفەرموێت :

﴿ وعباد الرحمن الذين يمشون على الارض هونا ، واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما ، والذين يبيتون لربهم سجدا وقياما ﴾

جارێکی تریان توندتر دەکات ودەفەرموێ :

﴿ الصابرين فى البأساء والضراء وحين البأس ، أولئك الذين صدقوا و أولئك هم المتقون ﴾

جارێکیتر فەرمان دەکات بۆ شوێنی تاقیکردنەوەو گۆرەپانی جیهاد ، جا دەفەرموێت :

﴿ انفروا خفافا وثقالا ، وجاهدوا بأموالكم وأنفسكم فى سبيل الله ، ذلكم خير لكم ان كنتم تعلمون ﴾.

هەروەها دەفەرموێت :

﴿ فاذا لقيتم الذين كفروا فضرب الرقاب ، حتى اذا أثخنتموهم فشدوا الوثاق ﴾ .

جابەراستی لە نیو موسلمانان پیشەیەك سەری هەلداوە دەلین پیویستە قورئان لەبەرەكان لایەنیكی سلبی بنوینن و جیابینەوە لەنیو خەلك ، ئەم پیشەیەش شتیكی هەلەیەو ناشیت ئەمە ببیت ، لەبەر ئەوەی ئەم قورئانەی جیگای خۆیەتی پیی‌بلیین كیتابی ئاسایش وبەزەیی ، هەروەها جیگای خۆیەتی پیشی بلیین كیتابی هیز وداستان .

ئەوانەی پیش ئیمە لەسەردەمی پیغەمبەر ﷺ قورئانیان لەبەر دەكرد ، بەلام نەك بۆ شانازی كردن بەلەبەركردنەكەی ، یان بۆ پیشبركی كردن لە ئاوازو ، یان تەنها وتەنها لە شوینی خەفەتباری و گۆرستان بیلینەوە ، یان لە پرسە پارەی پێكۆبكەنەوەو لەسەر نەخۆش ومردوو بیخویننەوە ، بەلكو ژیانیان پیی ئاوەدان دەكردەوەو بەكاریان دەهینا بۆ چاككردنەوەی هەست ونەستیان و دەیانكرد بە پیشەوای خۆیان لە كاتی ئاشتی وجەنگدا ، لەیەك ساتدا بۆیان دەبوو بە روناكی وئاگر ، ئەمەش روناكیە بۆ ئەو كەسەی هیدایەت دراوەو ریگای راستی گرتووە ، هەروەها ئاگریشە بۆ یەكیك سەرلیشیوا و بی وریگای چەوتی گرتبیت :

﴿ وننزل من القرآن ما هو شفاء و رحمة للمؤمنين ، ولا يزيد الظالمين الا خسارا ﴾

جا ئەم یاوەرە بەریزە سینگی پربوو لە قورئان ، بە ویستی خوا دەیگەیشتێ وله ژیانیدا ببوو بە نموونەی برواداری قورئانی ، پەیوەند بەپەتی خودا لە هەموو سات وكاتیكدا ، جائەم یاوەرە بەریزە میحرابەكەی خۆی ئاوەدان كردبۆوە بە خواپەرستی وتەرتیل ، هەروەها لە كاتی جیهاددا دەستی دەدا چەكەكەی بۆ ئەوەی تیبكۆشێ بۆ سەرخستنی ئاینەكەی .

ئەم یاوەرە بەریزە ناوی ( باوكی زەید ) سەعدی كوری عوبەیدی نەعمانی كوری قەیسی ئەوسی ئەنصارییە

هەروەها سیرە باسی ئەم یاوەرە دەكات كەوا ( الحافظ للعهد ، الوافي بالوعد ) بووە

واتە: ( خاوەن پەیمان و بۆ بەلین بەوەفا ) بووە

هەروەها نازناوی سەعد بە ( قورئانخوین ) رۆیشتووە لەبەر ئەوەی یەکیك لەم چوار ئەنصارییەیە کەوا قورئانیان کۆکردەوەو قورئانیان لەبەر کرد لەسەردەمی پیغەمبەری خوا ﷺ .

ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا ریوایەت دەکا کە قەتتادە دەگیریتەوەو دەلیت :

پرسیارم کرد لە ئەنەسی کوری مالیك : کێ لە سەردەمی پیغەمبەری خوا ﷺ قورئانی کۆکردەوە ؟؟

گووتی: چوار بوون هەموویان لە ئەنصار بوون ؛ ئوبەی کوری کەعب ، موعاذی کوری جەبەل ، زەیدی کوری ثابت و باوکی زەید ( سەعدی کوری عوبەید) ،خوا لەهەموویان رازی بیت

بەراستیئەنصارەکان شانازیان دەکردبەم چوارە جا دەیانگووت:

لە ئیمە چوار کەس لەسەردەمی پیغەمبەری خوا ﷺ قورئانیان کۆکردەوە ، ئوبەی کوری کەعب وموعاذی کوری جەبەل و زەیدی کوری ثابت و باوکی زەید

دەبیت ئەوەش بزانین ئەوانەی لەسەردەمی پیغەمبەر ﷺ قورئانیان کۆکردەوە لە یاوەران لەمە زیاتر بوون ، لەوانە

عوسمانی کوری عەففان و ئوبەیکوری کەعب و معاذ کوری جەبەل و أبوالدرداء وزەیدی کوری ثابت و ئەبو زەید ( سەعد کوری عوبەید) بوون

ئیبن سیرین دەلیت: هەروەها( تەمیمیداری) شیان لەگەل بوو .

قورطوبی دەلیت

( عوبادەی کوری صامت و ئەبو ئەییوب) یشیان لەگەل بوو .

سەعد خوا لیی رازی بیت هەلدەستا بە پیش نویژی خەلك لە مزگەوتی ( قوباء) لە زەمانی پیغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها لە زەمانی ئەبوبەکرو عومەریش ، وە مزگەوتی قباء یەکەم مزگەوت بوو دروست کرا لە ئیسلام ، هەروەك لە تەفیسر ریوایەت دەکات دەلیت ئەم مزگەوتەیە کە خوای گەورە لە سورەتی (تۆبە) ئایەتی لەسەر دابەزاند :

﴿ لمسجد اسس على التقوى من أول يوم أحق أن تقوم فيه ، فيه رجال يحبون أن يتطهروا ، والله يحب المطهرين ﴾

وه پلەی پیشنویژیش له نویژدا پیویست بوو هـەموو هۆیـەکانی گەیشتن به قورئانیلی بیتەجێ لەلەبەرکردن و دەربرین

هەرچـەندە دڵ ودەروونـی سـەعدی کـوری عوبـەیدی ئـەنصاری رونـاك ببـۆوه بـه قورئـانی خـوای گـەورەو زمـانی پـاك ببـۆوه بـه خویندنـەوەی ئایەتـه پیرۆزەکـان و نویژەکـانی رازابـۆوه بـه ووشـه قورئانیه موعجیزەکان ، وه هەر یەکیك بهاتبایەلای لەموسلمانان بـۆ فیربوون ئەوا سستی لی نەدەکرد و ، لەگەل هەموو ئەمانەش سـفرەی قورئانی پیرۆز ( سەعدی کوری عوبادی ) خەریك نـەدەکرد بەشـداری نەکات له گۆرەپانی تیکۆشان و بەرخودان .

بەلکوو لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز یەکەم هۆکار بوو کـەوا پـالی بنیت وبەرەو شوینی قارەمانیەتی و میرخاسی ببات ، لەبـەر ئـەوەی قورئان پەراوی جیهاد و دەستووری تیکۆشانه ، لەبەر ئەوه سـەعدی کـوری عوبـەید هـەروەکوو موجـاهیدیك دەرچـوو لـه پینـاوی خـوای پەروەردگاری له رۆژی سەرهەلدانی جیهاد له ئیسلام ، جەنگی بەدر و ئوحود و خەندەق و هەموو جەنگەکانیتری بینی ، بەمه سەعد بوو به سەرمەشقیکی کرداری لەسەر ئەوەی کەوا ماوه لەسەر قورئانی پیرۆز بەلەبەر کردن و خویندنەوه ، هەر کاتیك بانگ کرابێ بۆ جەنگ ، ئەوا روناکی خوا لەدڵ ودەروونی هەلیدەگرێ وبەردەوام بەرەو تیکۆشـانی دەبات ، جەنگ لەدوای جـەنگ تـاکوو ببیـت بـه بەلگەیـەکی کـرداری لەسەر ئەوەی کەوا نەوەکانی قورئان ئەوانەن که راسپاردەکانی بەجێ دەگەیەنن وبانگەکەی بەرز دەکەنەوەو ئالاکەی له نیـو جیـهاندا بلنـد دەکەن .

بەم جۆره سەعدی کوری عوبەیدی ئەنصاری له ژیاندا مایـەوه تاکوو پاش مردنی پیغەمبەر ﷺ بەراستی کاری دەکرد لەسەر سفرەی قورئان و گۆرەپانی جیهاد ، هەروەك دەبینین له کردار قورئانخوینەو جیهاد به زمانی دەکات ، وه ئایەتەکانی پەروەردگاری به تەواوی بـه تەرتیل دەخوینیتەوه ، هەروەها دەبینین له جەنگـەکان قارەمانیکـه ئایەتەکانی جیهاد له سینگی پالی دەدا بـۆ شـوینەکانی بـەرخودان و خۆ بەقوربانیدان .

جا سالی شازدەی کۆچی ئەوەبوو جەنگی (قادسیەی)ی گەورە دیت کەوا روودەدا لە نیوان موسلمانان و فارسەکان ، قادسیە شاریك دەبیت پازدە فەرسەخ لە کوفە دوورە

لەم جەنگەدا موسلمانان شەریکی قارەمانانەیان کرد و سەرکەوتنیکی گەورەیان تۆمار کرد .

هەروەکوو یاقوت الحموی لە کتیبی (معجم البلدان ) دەربارەی ئەم جەنگە دەلیت :

لە گەورەترین و گرنگترین جەنگەکانە کە موسلمانان ئەنجامیان دا وە ، وە لە هەموو جەنگەکان بەبەرەکەتتر بووە

شایانی باسە باوکی زەید ( سەعدی کوری عوبەیدی ئەنصاری ) لەم جەنگە بەشداری دەکات .

میژوونوسان دەلین :

قورئان خوینەکان لەسەرەتای ئەم جەنگە ئایەتی جیهادیان دەخویندەوە ، ئینجا کێدەزانێ لەوانەیە باوکی زەید( سەعدی کوری عوبەیدی ئەنصاری ) لە پیشەنگی ئەم قورئان خوینانە بووبێ ؟

ئینجا چ لەوە خۆشتر نیە لەسەرەتای دەستپیکردنی جیهاد دروشمی قورئان بخویندریتەوە تاکوو گیانی خۆراگری و خۆشەویستی شەهادەت لە دەروونی موجاهیدان برویندری

پاشان سەعد پیش جەنگ ووتاریك دەدا پرلە حەماسەت ، جا ئەم ووتارە بۆخۆی و هاوەلەکانی دەلیت:

( انا ملاقوا العدو غدا ، وانا مستشهدون غدا ، فلا تغسلوا عنادما ، ولا نكفن الا في ثوب كان علينا )

واتە : ( ئیمە بەیانی بە دوژمنەکانمان دەگەین و ئیمە بەیانی شەهید دەبین ، جا خوینمان لەبەر مەشۆن و ، کفنمان مەکەن بیجگە لەو جلەی لەبەرمانە ) .

بەمجۆرە سەعد بریاری لەسەر راستی جیهادەکەی دەدا و هەولی دەدا بگات بەشەهیدی ، وە سوربوو لەسەر ئەوەی بە خوین وجلەوە بینیژن بۆ ئەوەی ببیت بە ویسام وبەلگە لەلایەن پەروەردگاری ، ئەو پەروەردگارەی کەوا کردەوەی هیچ کەسیك لەیاد ناکات ، هەروەها بۆ ئەوەی هیچ کەلوپەلیکی دونیا وئارەزووەکانی نەبیت بە هاوریی و تەنها وتەنها کفنی بکەن بە جلی جیهاد ،

جابەراستی ئەو جلەی خوین وتۆزی جەنگی پیوە بیت بە نرخترین جلوبەرگە ، ئەمەش لەسەر فەرموودەی پەروەردگاری کە دەفەرمویت:

﴿ يوم لا ينفع مال ولا بنون الا من أتى الله بقلب سليم ﴾

ئینجا بەراستی سەعدی کوری عوبەید راستی کرد لەگەل ئەو پەیمانەی بە خوای دابوو ، بەوەفابوو بۆ بەلینەکەی ، بەردەوام تیکۆشا وجیهادی کرد تاکوو لەسەر ئەسپەکەی نیعمەتی شەهادەتی پێ بەخشرا لە جەنگی قادسیە ، لەسالی شازدەی کۆچی ، تەمەنی پیرۆزی ئەوکات شەست وچوارسال بوو ، خوای گەورە لیی رازی بیت.

هەروەك لیمان روونە بەرووبوومی چاك خۆراکی چاکی لیدروست دەبیت ، سەعدیش لە دوای خۆی کوریکی لەدوا بەجیما بە ناوی( عومەیر ) ، ئەمەش یەکیك بو لە یاوەرە بەریزو دونیا نەویستەکان ، لە فەتحی ناوچەکانی شام هەروەك موجاهیدیك بەشداری کرد ، جالەبەر پاکی و جیگای بروایی ، ئیمامی عومەر ﷺ کردی بە کاربەدەست لە سەر ( حمص ) ، هەروەك ئیمامی عومەر ﷺ دەرهەقی ( عومەیر ) دەیفەرموو :

(( وددت أن لي رجالا مثل عمير بن سعد ، أستعين بهم على أعمال المسلمين ))

واتە: ((خۆزگەم دەخواست هەندیك پیاوی نموونەی عومەیری کوری سەعدم هەبوایە ، بۆ ئەوەی پشتم پییان ببەستایە لە کاروباری موسلمانان ))

عومەیری کوری سەعد خانووەکی هەبوو لە فەلەستین ماوەیەك تییدانیشتەجێ بووپاشان لەسالیچل وپینجی کۆچیکۆچیدواییکرد

جابەراستی لیرەدا سەعدی کوری عوبەید داستانی عبداللەی کوری موبارەکمان بەیاددا دەهینیتەوە کە ئەویش شوینکەوتەی ئەم یاوەرە بەریزەیە ونامەیەك بۆ هاورییەکەی ( فضیل کوری عیاض ) دەنیرێ و تییدا سەرزەنشتی هاورییەکەی دەکات لەبەر ئەوەی کاتیك بانگەوازی زەنگی جیهاد لیدرا ئەوا هەموو خواپەرستیەك بەرامبەر بە جیهاد کیشی کەمەو لە تەرازووی ئەو دانانریت ، هەروەك دەلیت

ياعابد الحرمين لو أبصرتنا — لعلمت أنك فى العبادة تلعب
من كان يخضب خده بدموعه — فنحورنا بدمائنا تتخضب
أوكان يتعب خيله فى باطل — فخيولنا يوم الصبيحة تتعب
ريح العبيرلكم ونحن عبير — رهج السنابل والغبار الأطيب
ولقد أتانا من مقال نبينا — قول صحيح صادق لا يكذب
لايستوى، غبا رخيل الله فى — أنف امرىء، ودخان نار تلهب
هذا كتاب الله ينطق بيننا — ليس الشهيد بميت، لايكذب

ئينجاليرەدا ئيمە تەنھا واتاى دوو ديږ ليكدەدەينەوە :

ئەىخواپەرستىدوومزگەوتان(مەككەومەدينە)ئەگەرئيمەببينى
بەراستىدەزانىكەتۆ لەناوخواپەرستىيارىدەكەيت
تۆ روخسارت ئەگەر بەدلۆپىفرميسكەكانت تەر ببيت
ئەوا ملى ئيمە بە خوينمان رەنگريژ دەبيت

بەلێ كاتيك فضيلى دونيا نەويست وزاهيد لە مزگەوتى حەرام ئەم نامەى خويندەوە گريا وگووتى : صدق أبو عبدالرحمن ونصح
واتە: باوكى عبدالرحمن راستى فەرمووەو ئامۆژگارى كردووە
چەند رۆژگاريك وسالانيك بەسەرچووئيبن موبارەك پيش (فضيل) كۆچى دوايى كرد ، فضيل لەخەودا بينى،جاليى پرسى
چ كردەوەيەكت بينيوە لە هەموو كردەوان چاكتر بيت ؟
ئيبن موبارەك وەلامى دايەوەو گووتى
ئەو كردەوەى لەسەرى بووم ( واتە جيهاد لەريگاى خودا ) .
فضيل پيى گووت : خوا چى لەگەل كردوويت ؟
ئيبن موبارەك لە وەلامدا گووتى
( غفرلى مغفرة ما بعدها مغفرة).
واتە ليم خۆشبوو بە ليخۆشبوونيك لەدواى ئەو هيچ ليخۆشبوونيك نيە .

**رەزاى خودا لە ياوەرى سەرمەشق**
**( سەعدى كورى عوبەيدى ئەنصارى ) بيت**
**خواى گەورە بەم ياوەرە شيرينە شادمان بكات .**

# ﴿١١٦﴾
# خەنساءی کچی عەمر
## * دایکی شەهیدان *

ئافرەتێك بوو هەموو سیفەتێکی بەرزی پرشنگداری بەخۆوە گرتبوو هەر لە زیرەکیەوە بگرە تاکوو تەقواو ئازایەتی و ئارام ، هەروەها لە هۆنینەوەی شیعریش هیچ پیاوو ژنێکی شاعیر نەیتوانیوە شان لە شانی بدات ، بەمجۆرە کانیاوی شیعر لە نێو زمانیدا هەڵدەقوڵا پاش ئەوەی کوژرانی (صخر)ی برای بە چاوی خۆی بینی ، جا ئەم ئافرەتە بە مەزنترین شاعیرە دادەنرێت لە شیعری ( رثاء ) واتە: بەسەردا هەڵگووتن...

یەکێك لە جوانترین شیعرەکانی کەبەسەر ( صخر) دا دەڵێت:

قذى بعينيك أم بالعين عـوار　　　أم أقفرت اذاخلت من أهلهاالدار

وە یەکێك لە شیعرە جوانەکانی تریشی

أعينـي جـودا ولا تجمـــدا　　　ألا تبكين لصخر النـدى

ألاتبكيان الجرىء الجميـل　　　ألا نبكيان الفتى السيـدا

خەنساء ناوی ( تماضر کچی عەمر ، کوری حارثی کوری شرید ) بووە . خەنساء لەگەڵ هۆزەکەی (بني سـليم) چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وە موسلمان بوونی خۆی راگەیاند ، بوو بەموسلمانێکی تەواو ، تاکوو بووە نیشانەیەك لە نیشانەکانی ئافرەتانی ئازاو چاونەترس و دەروون بەرزو سەرمەشقی دایکانی موسلمانان .

پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی بە شیعرەکانی دەکردو شیعری پێدەگووت وپێی دەیفەرموو:

( هيه يا خناس ويومی بسيده )

کاتێك عدی کوری حاتەم هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گفتوگۆی لەگەڵ کردو پێی گووت:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین شاعیرو سەخیترین کەس و سوارچاکترین کەس لەناو ئێمەدا هەیە ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :(سمهم)　واتە : ناوەکانیان بڵێ .

گووتی : هەرچی شاعیرترین کەسیانە ( امرؤالقیس کوری حجر) ـە ، هەرچی سەخیترین کەسە بریتی‌یە لـە (حاتـەم کـوری سـەعد) واتـە بـاوکی، هـەرچی سـوارچاکترین کەسـە بریتیـە لـە ( عـەمری کـوری معدیکرب) ـە.

پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

**﴿ لیس کما قلت یاعدی ، أما أشعر الناس فالخنساء بنت عمرو ، وأما أسخی الناس فمحمد ﷺ یعنی نفسه ، وأما أفرس الناس فعلی ابن طالب ﴾ .**

واتە:﴿ ئەی عەدی وانیە ، وەکوو تۆدەلییت ، شاعیرترین کـەس خەنسای کچی عەمرە ، سەخیترین کەس موحەممەدە ﷺ واتـە خـۆی ، هەرچی سوارچاکترین کەسە ئەوە عەلی کوری ئەبوطالیبە ﴾

بەلێ لەگەل شاعیریەتی ئەم یاوەرە ئافرەتە کـەوا هـانی خـەلکی دەدا بۆ جەنگ ، وسیفەتی ئازایەتی پیـوە دیـاربوو وە زۆر هەلویستی قارەمانانەی هەبوو لەریگای سەرخستنی ئاین وهەق ، جـا لەگـەل زۆر لە غەزاکانی موسلمانان دەرچووە و یاوەریەتی سوپا سەرکەوتووەکەی کردوون .

کاتیك مثنی کوری حارثەی شیبانی رووی لە قادسـیە کـردووە لـە سـەردەمی ئـەمیری بڕواداران عومـەری کـوری خطـاب خەنسـاء بـە خۆیوچوار کورەکەی لە گـەلیان دەرچـوون لـە یاوەریـەتی ئـەم سـوپا مەزنە بەشداری کردووە

جالە ناوەراستی مەیدانی جەنگ و شەوی پیکدادانی هەردوو سوپا لـە گـەل یـەکتریدا ، خەنسـاء هـەر چـوار کـورە شـیرینەکەی خـۆی کۆکردەوە بۆ ئەوەی هانیان بدات بۆ جەنگ و تـاکوو پشـت لـە دوژمـن نەکەن ، هەروەها شەهادەتیان لە ریگـای خـوا لەلاشیرین بکـات ، جـا خوشك وبرایان گوێ بدەنە ئەم ئامۆژگاریە مەزنە کاتیك دەلیت

( ئەی رۆلەکانم ئیوە بە ویستی خۆتان موسلمان بوون ، خۆتـان کۆچتان کرد ، جا سویند بەو خوایەی تاك وتەنیایە وهیچ خوایـەك نیـە بیجگە لەئەو ، بەراستی ئیوەکوری یەك دایکن وناپاکیم لەگەل باوکتان نەکردووەو ئابرووی خالەکانم نەبردوون ، نە بنەمالەو نـەهۆزم ناشـیرن نـەکردوون ، هـەروەك دەزانـن خـودا پاداشـتی گـەورەی بـۆ موسـلمان

ئامادە كردووە لە جەنگی بێباوەڕان ، بشزانن ڕۆژی قیامەت باشترە لە دونیای بۆگەن ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمویت

﴿ ياأيها الذين امنوا اصبروا وصابروا ورابطوا واتقوالله لعلكم تفلحون ﴾

جا كاتیك بەیانیتان كردەوە ـ ان شاءالله ـ بەسەلامەتی ، خۆتان ئامادە بكەن بۆ جەنگی دوژمنان بە چاوكراوەیی وبەیارمەتی خوا بەسەر دوژمنانتان سەردەكەون ، كاتیك بینیتان جەنگ لەگەرمەیدایەو تۆز بەری ئاسمانی گرتووەو ئاگری لێبلنددەبیتەوە ، ئیوە برۆنە ناوەندی جەنگەكەو با جەنگەكە بتان هاریت جایان دەستكەوتتان بەدەست دەكەوی یاخود خوا ریزتان لێدەنیت بەشەهادەت .

هەر چوار كورە پالەوانەكەی بێدەنگ بوون وگوییان بۆ ئامۆژگارییەكانی دایكیان گرتبوو ، ووشە بە ووشە لە میشكی خۆیان تۆماریان دەكرد و بریاریاندا لە قسەی دایكیان دەرنەچن ، كاتیك بەیانی رووناكی دایەوە هەر یەكیكیان چووە سەنگەری خۆی ، هیرشیان برد بۆسەر دوژمنەكانیان ، ئەوەبوو یەكەمیان خۆی ئامادە دەكردبۆ گەیشتن بە دوژمنەكانی ودەیگووت

ياأخوتي‌ان العجوز الناصحة — قد نصحتنا اذ دعتنا البارحة
مقالة ذات بيان واضحة — فباكروا الحرب الضروس الكالحة
وانما تلقون عند الصائحة — من آل ساسان الكلاب النابحة
قدأيقنوا منكم بوقع الجائحة — وأنتم بين حياة صالحة
أو ميتة تورث غنما رابحة

پاشان هیرشی بردو تاكوو پلەی شەهادەتی بە دەست هینا ، دووەمینیان خۆی ئامادە كردو دەیگووت :

ان العجوز ذات حزم وجلد — والنظر الأوفق والرأى السدد
قد أمرتنا بالسداد والرشد — نصيحة منها وبرا بالولد
فباكروا الحرب حماة في العدد — اما لفوز بارد على الكبد
أو ميتة تورثكم عز الأبد — في جنة الفردوس والعيش الرغد

پاشان هیرشی بردو ئەویش پلەی شەهادەتی بە دەست هینا ، سێیەمیان خۆی ئامادە كردو گووتی

والله لانعصى العجوز حرفا — قد أمرتنا حربا و عطفا
نصحا وبرا صادقا ولطفا — فبادروا الحرب الضروس زحفا

حتى تلقوا آل كسـرى لفا — أويكشفوكم عن حماكم كشفا
انانرىالتقصير منكم ضعفا — والقتل فيكـم نجدة وزلفـى

پاشان هیرشی بردو جەنگا تـاکوو شـەهیدکرا، چوارەمیـان خـۆی ئامادە کردو دەیگووت :

لسـت للخنسـاء ولا للأخـرم — ولالعمـرو ذیالسنـاء الأقدم
ان لم أردفیالجیش جیش الأعجم — ماض علیالهول خضم خضرمی
امـا لفـوز عـاجـل و مغنـم — أو لـوفـاة فی سبیـل الأکـرم

پاشان هیرشی بردو جەنگا تاکوو ئەویش شەهید کرا

کـاتیك هـەوال گەیشـتە دایکـی بـرواداری ئـارامگر ، نـەگریاو نـە فرمیسکی هەلرشت بەلکوو قسـەیەکی کـرد ئیستاوئیسـتاش لـە میـژوو دەپلینەوە ، وەهەتا هەتایە ئەم قسەیە هەر دەمینیتەوە ، ئەمەش ئەم چەند ووشەیە بوو : ( الحمدلله الذی شرفنی باستشهادهم ، وأرجـو مـن ربی أن یجمعنی بهم فی مستقر رحمته )

واتە:( حەمدوسوپاس بۆ ئەو خوایەی ریزی لینام بە شەهیدبوونی ئەمانە وەتکاکارم لەپەروەردگارم لەکۆشیبەزەییخۆیکۆمان بکاتەوە).

بـەلێ ئەمەیـە ئیمـانی ئـافرەتی موجـاهیدو خوانـاس ، کورەکانیپەروەردە کردن لەسەر راسـتیوپاکیو ئازایـەتی وکردنـی بـە قوربـانی ئـایینی خـوا و بـۆ هیـچ مەبەسـتیکی گـەورەیی دونیـاو خۆدەولەمەند کردن گەورەی نـەکردن ، دایکیـك دلـی پربـوو لـە ئیمـان وبروایی وخۆراگری و خۆشەویستی ئایینی خوا

ئیمامی عومەر ﷺ لەبەر ئەوەی بـە گـەورەیی خەنسـای زانیبـوو جانەرزاقی هەرچوار کورە شەهیدەکانی پیدەبەخشی .

خەنساء لە بیابان لە سەرەتای خەلافەتی ئیمامی عوسمان ﷺ لـە سالی (٢٤) ی کۆچیگیانی پاکی بەپەروەردگار سپارد

**رەحمەتی خودا لە پاوەری بەریزی پیغەمبەری خوا ﷺ خەنسای دایکی شەهیدان بیوگۆرەکەی پرنوور بیّ ،خوای گەورەش سەبووری بدا بەهەموو ئەو دایکانەی کەوا کورەکانیان لەریگای خودا گیـانی پاکیان بەخشیوە  جاچ لە ئەفغانستان بیّ وچ لە ئـەریتریا وچ لـە فلیپین و چ لە شیشـان وچ لـە فەلەسـتین وچ لـە بۆسـنەوچ لـە کوردستان و چ لەکشمیر ، یان هەرسووچیکی تری دونیا بیت .**

# (١١٧)

## خەولەی کچی ثەعلەبە

ئەو ئافرەتەی خوای گەورە
لەسەر حەوت تەبەقەی ئاسمان
گوێی لە سکاڵای گرت

﴿١١٧﴾

# خەولەی کچی ثەعلەبە
# ئەو ئافرەتەی خوای گەورە لە حەوت
# طەبەقەی ئاسمان گوێی لە سکاڵای گرت

ئەو ئافرەتە ناوی ( خەولەی کچی ثەعلەبەی کوری أصـرم کـوری فهرکوری ثعلبەکوری غنم کوری عوف) ـە، میردی کرد بە ئەوسی کوری صامت کوری قەیس برای عبادە کوری صامت ئەم یاوەرە بەریزە بەدرو ئوحودو هەموو دیمانـەکانی( جەنگـەکان ) لەگـەل پیغەمبـەری خـوا ﷺ بینی ، کوریکی لیبوو بەناوی ( الربیع ) .

خەولەی کچی ثعلبەبەخۆی داهاتەوە پاش ئەوەی ئەوسـی کـوری صامتی میردی لەشتیك لیی توورەبوو وئەمەی پیگووت :

(أنت علي كظهر امي )

واتە : ( تۆبۆمن وەکوو پشتی دایکم وایت ).

پاشان پیاوەکەی چووە دەرەوە پاش ئەوەی ، ئەوەی دەریبری ئـەوا دەریـبری لـەدیوەخانی هۆزەکـەی دانیشــت ، پـاش کـاتژمیریك گەرایەوە مالەوە وداوای سەرجێیی لیکرد، بەلام لیرەدا هەستی ویژدان وئاینی لە خەولـەدا بەدیارکـەوت ، رازی نـەبوو بـەم داواکاریـەی تـاکوو فەرمانی خوای لەسەردانەبەزیت لەسەر ئەم رووداوەی کەوا لە میـژووی ئیسلام بۆ یەکەمین جار روویدا  جالیرەدا خەولەبەمیردەکەی گووت

( كلا والذي نفس خولة بيده ، لاتخلصن الي وقد قلت ماقلت حتى يحكم الله ورسوله فينا بحكمه ).

واتە: نەخیر بەو خوایـەی گیـانی خەولـەی بەدەسـتە ، لەدەسـتم رزگاریت نابیت ، بەراستی ئـەوەی گووتـت ئـەوا گووتـت تـاکوو خـواو پیغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانمان لەنیوان دەکات .

لیرەدا خەولە چووە دەرەوە تاکوو پیغەمبەری خوا ﷺ گەرایـەوە ، جالەبەر دەستی دانیشت وحال ومەسەلەی میردەکەی بۆ گیرایـەوە ، بەم جۆرە دەیویست لەم مەسەلەیە فتوای بۆ بدات و قسە لەسـەر ئـەم کارە بکات ، پیغەمبەری خوا ﷺ پیی فەرمووی :

﴿ ماأمرنافي أمرك بشيء ... ماأعلمك الا قد حرمت عليه ﴾ .

واتە:﴿ هیچ شتیکمان فەرمان پینەکراوە سەبارەت بـە کارەکـەی تۆ... بەلام ئەوەی من بیزانم تۆبۆی حەرام بوویت ﴾.
ئافرەتی برواداریش قسەکەی دەگووتەوەو بۆ پیغەمبەری خـوای ﷺ روون دەکردەوە چارەنووسی مندالەکەی بەچی بگات ئەگەر ئیسلام لە میردەکەی جیای‌بکاتەوە ، لە هەموو جارەکـان پیغەمبـەری‌خوا ﷺ پیی دەفەرموو :
﴿ ماأعلمك الا قدحرمت عليه ﴾
واتە:﴿ ئەوەی من لیی‌بزانم تۆبۆی حەرام بوویت ﴾
لیرەدا ئافرەتی بروادار بەدلی پرلەخەم وئازار دەستی‌بۆ ئاسمـان بەرز کردەوە لە کـاتیکدا فرمیسک لـە چاوەکـانی دەهاتـە خـوارەوە ، رووی لە یەکیك کرد کەهەرگیز لیی وون نەدەبوو ، بەم نزاوپارانەوەیە:
( اللهم انی أشكو اليك ماأنزل بی... ) .
واتە: خودایە سکالات لەبەر دەکەم شتیکم لەسەردابەزینیت .
ئای لەبەر ئیمـانی راسـتی ئـافرەتی بـرواداری نموونـەی خەولـە ، دەبینین وەستاوە لەژیردەستی پیغەمبەری خـوا ﷺ گفتووگۆی لەگـەل دەکاو داوای فتوای لی‌دەکات ، بەلام هاوارو سـکالاتەنهاوتەنها بۆخـوای گەورەیە ، ئەوەش ئیمان وبرواییە کەوا لە یاوەرانی پیغەمبەری خوا ﷺ زانراوە
ماوەیەکی زۆری پینەچوو هیشتا ئـەم ئافرەتـە لـەدوعاو نزاکـانی نەبووبۆوە تاکوو سیبەری نیگا رووی لە پیغەمبەری‌خوا ﷺ کردو نیگای بۆ دابەزی ، پاشان نیگابەری‌دا ، پیغەمبەری‌خوا ﷺ فەرمووی :
﴿ ياخويلة قدأنزل الله فيك وفی صاحبك قرآنا ﴾.
واتە:﴿ ئـەی خەولۆکـە بەراسـتی خوالەسـەر تـۆو پیاوەکـەت قورئـانی دابەزاندووە ...﴾.

پاشان ئەم ئایەتانەی بۆ خویندەوە
﴿ قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي إلـــى اللـــه والله يسمع تحاوركما إن الله سميع بصير {١} الذين يظاهرون منكـــم من نسائهم ما هن أمهاتهم إن أمهاتهم إلــــا اللـــائي ولدنـــهم وإنـــهم ليقولون منكرا من القول و زورا وإن الله لعفو غفـــور {٢} والذيـــن يظاهرون من نسائهم ثم يعودون لما قالوا فتحرير رقبة مـــن قبـــل أن

يتماسا ذلكم توعظون به والله بما تعملون خبير {٣} فمـــن لـــم يجـــد فصيام شهرين متتابعين من قبل أن يتماسا فمن لـــم يســـتطع فإطعـــام ستين مسكينا ذلك لتؤمنوا بالله ورسوله وتلك حدود الله وللكـــافرين عذاب أليم {٤} ﴾. ( المجادلة ١-٤ ).

پاشان پيغەمبەرىخوا ﷺ كەفارەتى سويندى (ظهار)ى بۆ ديارى كردوپيىفەرموو:

﴿ مريه فليعتق رقبة ﴾.

واته:﴿ فەرمانى پىٚبكە بەندەيەك ئازاد بكات ﴾...

ئافرەتەكە گووتى

ئەى پيغەمبەرىخوا ﷺ هيچى نيه بەندەى پىٚئازاد بكات

پيىفەرموو :﴿ فليصم شهرين متتابعين ﴾

واته :﴿ بادوومانگ لەسەر يەك بەرۆژووبيت ﴾.

گووتى: سويندبەخوا بەسالآچووە ناتوانيت بەرۆژوو بيت .

فەرمووى :﴿ فليطعم ستين مسكينا من تمر ﴾.

واته :﴿ با شيست هەژار بەخورما نان بدات ﴾.

ئەويش گووتى : سويندبەخوائەى پيغەمبەرىخوا ﷺ تواناى نيه

پيغەمبەرىخوا ﷺ فەرمووى:﴿ فانانستعينه بفرق من تمر ﴾.

واته:﴿جائيمه يارمەتى دەدەين بەچەند بەشە خورمايەك ﴾...

خەولەش گووتى : ئەى پيغەمبـەرىخوا ﷺ منيـش يارمـەتى دەدەم بـە چەند بەشە خورمايەك

پيغەمبـەرىخوا ﷺ پيىفـەرموو :﴿ قدأصبت وأحسنت فـاذهبى فتصدقى به عنه ، ثم استوصى بابن عمك خيرا ﴾

واته:﴿ بەراستىكارەكىراست وچاكت كردو جـابرۆ لـەجياتى ئـەو بيدە، پاشان ئامۆژگارى باشى ئامۆزاكەت بكە﴾ منيش كردم .

ئەمەش چيرۆكى (المجادله)ى گەورەى هەموو ئادەميزادە ﷺ كەوا ناوەرۆكەكەى بەلگەيە لەسەرئەوەى ئافرەتى بروادار لـە ئيسلام چۆن ريزى لىدەگيرىّ وسەربلندەو گرنگى پىٚدەدريت

عائيشـە ؓ لـەم بارەيـەوە دەليـت: ( سـوپاس وسـتايش بۆئـــەو خوايەىئاگادارى هەموو شتيكە ،ئەم گفتوگۆيە لەگـەل پيغەمبـەرىخوا ﷺ كراو قسەى لەگەل دەكردو منيش لە سـوچيكى مالەكـە بـووم گويـم لىنەبوو چيان دەگووت ، جاخواى گەورە ئەمەى دابەزاند

﴿قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي إلــى اللــه والله يسمع تحاوركما إن الله سميع بصير﴾ .

ئەم ئافرەتە بروادارەی کەوا ئیسلام پــەروەردەی کرد بەرامبەر خەلیفەی بروادارا‌ن عومەری کوری خەطاب ﷺ لە ریگادا دەوەستێ بۆ ئەوەی ئامۆژگاری بکاوپەندیبدات ئەم قسانەی پێدەلیت

( ئەی عومەر لەکاتیخۆی بەتۆیان دەگووت عومــەرۆك پاسەوانی بازاری عوکازت دەکرد لەمنداڵان ، رۆژگار هات بووی بەعومەر ، پاشان ئەوەندەی نەبرد تــاکوو بــووی بــە ئــەمیری بـروادارا‌ن ، جالەخوابترسە بەرامبەر میللەت ، بشزانە بەراستی یەکیك لەرۆژیدوایی بترســێ دووری لە خۆنزیك دەکاتەوە ،وەهەر کەسیك لەمردن بترسیت کات بەفیرۆنادات ، وەهەر کەسیك لە لیپرسینەوەی رۆژی دوایی دلنیــابیت لەسزای خوا دەترسیت )...

ئەم قسـانەی دەگــووت وعومـــەری ئــەمیری بـروادارا‌ن بــەپیوە وەستابوو سەریخۆی بۆ دەلەقاندو گوییلە قسەکانی دەگرت.

بەڵام جارودی عەبدی کەوا یاوەریتیعومەری کوریخەطابی دەکرد بە ئافرەتەکەی گووت :

(ئەی ئافرەت بەراستی زیادەرۆییت کردلەسەر ئەمیری بروادارا‌ن)

ئیمامی عومەر پییگــووت دیارە نایناسیت ؟ وازی لی بهینــە ، ئەوە خەولەیە کەوا لەســەر حــەفت طەبەقــەی ئاسمـان گوییــان بۆگـرت جاعومەر موستەحەقە گوییبۆ بگریت .

لەریوایەتیکیتردا دەلیت : عومەر گووتی:

( سویندبەخوا ئەگەر تاکوو شەوم بەســەرداديت رامبگریـت نـارۆم تــاکوو کارەکـــەی بۆجیبەجیدەکــەم تەنــها ئەگــەر کاتینویژنــەبیت جانویژدەکەم ، پاشان بۆلای دەگەریمەوە تاکوو کارەکەی بۆ جیبەجی دەکەم ).

## رەزای خوا لە ئافرەتی بروادا‌ری هەقناس و مافناسیخوا خەولەی کچی ئەعلەبە

## ﴿١١٨﴾
## أم كلثومی كچی عەلی كوری ئەبوطالب
## دایكی بروادار

( أم كلثوم ) كچی عەلی‌كوری‌ئەبوطالبە ، ئەو عەلیەی یەكەمین كەس بوولە منداڵان موسلمان بوو ، بەرزترین پلەوپایەی هەبوو لەلای پیغەمبەری خوا ﷺ كەواله‌جیگای برای خۆی دادەنا لە دونیاوقیامەت ، هەروەهاپیغەمبەری‌خوا ﷺ باپیرەی ( أم كلثوم ) بوو ، دایكیشی گەورەی ئافرەتانی‌بەهەشت فاطمەی‌كچی پیغەمبەری‌خوا ﷺ بوو، هەروەها خوشكی هەردوو گەورەی گەنجانی بەهەشت وخۆشەویستانی پیغەمبەری‌خوا ﷺ حەسەن وحوسەین بوو ﷺ

لەم كەشە بەریزە ( أم كلثوم ) لەسەردەمی پیغەمبەری‌خوا ﷺ لەدایك بوو ، گەورەبوو تاكوو بوویە نموونەی كچانی بروادار كەلەسەر بنچینەی ئایین ورەوشت وشەرم پەروەردە بوو .

عومەری كوری‌خەطاب ﷺ دووەمین خەلیفەی راشیدین و دووەمین وەزیری‌دەستەراستی پیغەمبەری‌خوا ﷺ ودامەزرینەری یەكەمین دەولەتی ئیسلام وروخینەری دەولەتی فارس ودەرپەرینەری رۆمەكان لە ووڵاتی شام و گەورەی برواداران چووبۆ خوازبینی ئەم كچە بروادارە بێ‌نموونەیە

ئەوەبوو ئیمامی عومەر ﷺ داوای خوازبینی لە باوكی( ئیمامی عەلی ﷺ ) كرد، بەڵام ئیمامی عەلی ﷺ داوای لیبوردنی‌لە ئیمامی عومەركرد ئەمەش لەبەر بچووكی تەمەنی بوو بەرامبەر ئیمامی عومەر ، ئیمامی عومەر ﷺ پیی‌گووت :

(( زوجنيهايا‌أبا الحسن فاني‌أرصد كرامتها مالايرصده أحد))

واتە: پیم بدە ئەی باوكی حەسەن ، جابەراستی‌من ریزیكی وای لی‌دەنیم كەس ریزی وای لی‌نانیت

ئەویش رازی‌بوو و كچەكەی خۆی پیدا ، ئەوەبوو لەمانگی ذوالقعدەی سالی ١٧ی‌كۆچی گواستیەوەو بوو بەخیزانی ، ئەم ئافرەتە بروادارە لەلای مایەوە تاكوو ئیمامی عومەر ﷺ شەهیدكرا ، ئەوەبوو زەیدی كوری عومەری ئەكبەر وروقیەی كچی عومەری لی‌بوو .

یەکێك لەبەسەرهاتەکانی ( أم کلثوم ) خێزانی ئەمیری برواداران ، ڕۆژێکیان هەروەك عادەتیبوو لەشەوان دەردەچوو بۆ لێپێچینەوەی حالی خەلك ــ ئەم کارەش کارێکە هەموو لێپرسراوانی دەولەتی ئیسلامیلێیبەرپرسیارن ـ جابەلای چەندخێوەتگایەکیدەورەی مەدینە تێپەڕیگوێیلەنرکەو نالەی ئافرەتێك بوو لە نێو ڕەشمالێك ، پیاوێك لەبەر دەرگاکە دانیشتبوو ،ئیمامی عومەر سەلامی لێکرد وپرسیاری ئەحوالی لێکرد، پیاوەکە پێیگووت:

کەوا کۆچەرەو هاتووەبۆلای ئەمیری برواداران تاکوو شتێکی بداتێ ، ئیمامی عومەر پرسیاری ئەم ئافرەتەی لێکردکەوا گوێیلە نالەیبوو، پیاوەکەنەیزانیئەوەئیمامیعومەرەو ئەمیریبرواداڕانەگووتی:

ڕەحمەتی خوات لێبێت بڕۆلای کاریخۆت ، پرسیاری شتێك مەکە پەیوەندی پێت نەبێت

جائیمامی عومەر گەڕایەوە ئەمجارەیان جەختی لێکرد کەوا ئەگەر بتوانێیارمەتیبدات پیاوەکە وەلامی دایەوەو گووتی:

بەڕاستی خێزانەکەم کاتی منداڵ بوونیەتی وکەسی لەلانیە یارمەتی بدات

ئیمامی عومەر پیاوەکەی جێهێشت وبەخێراییگەڕایەوە مالەوەو چووەلای خێزانەکەی ( أم کلثوم ) وپێیگووت:

(هل لك في أجرساقه الله اليك؟ ).

واتە: ئایا پاداشتێکت ناوێت خوابۆتی ئامادە کردبێت ؟

( أم کلثوم ) گووتی: (پاش ئەوەی بەختەوەریوخۆشی ڕووی پیرۆزی گرتبۆوە بەم مزگێنیەی پێی گەیشت لە کاتێکداخۆشی بۆ ئامادە کردبوو ) ئەم خێروپاداشتەچیەئەی عومەر؟

ئەویش هەواڵەکەیپێدا، هەلسا بەخێرایی ئەوشتانەی بۆمندال بوون پێویست بوو ئامادەیکرد، ئیمامیعومەر مەنجەلێکی پڕلەڕۆن وئارد هەلگرت ولەگەل خێزانەکەی دەرچوون تاکوو گەیشتنە خێوەتگایەکە.( أم کلثوم ) لەئافرەتەکە چووەژوورەوەو یارمەتی ئافرەتەکەیدا بەوەی دایەن پێیهەلدەستێ ، ئەمیری بروادارانیش لەگەل پیاوەکە لەدەرەوە دانیشت وئەم خۆراکەی بۆ دەکولاندن کەلەکەل خۆی هێنابووی، کاتێك ئافرەتەکەمنداڵەکەیدانا،( أم کلثوم ) لە ژوورەوەی ڕەشماڵەکەگووتی:

ئەی ئەمیری بړواداران مزگینی هاوریکەت خوا کوریکی پیبەخشی ، پیاوەکە سەریسورما لەوەی ئەمیری بړواداران هاورییەتی دەکاو خۆراکی بۆئامادە دەکاو فووڵەئاگردەکات

لەهەمان کاتیشدا ئافرەتە ئەعرابیەکەش سەریسورما لەوەی خیزانی ئەمیری بړواداران دایەنی بۆدەکات لەناو رەشماڵ .

بەلیّ ئەمرۆکەش دەبینین هەموو دەولەتە خاوەن شارستانیەتە بیّناوەرۆکەکانیش ئەم راستیانە سەبارەت بە شارستانیەتی ئیسلام دەزانن کەوا چۆن سەرۆکی دەولەت وخیزانەکەی خزمەتی پیاوو ئافرەتیکی کۆچەر دەکەن ، بەلام پیّلەراستی نانین ؟؟

بەلام میللەتی نابەختەوەریش بە بەخششیخوا رازینابن ، ئەوەبوو دەستیکی گلاوی ناپاك دەستی دریژکرد بۆ ئەمیری بړواداران ، بۆعومەریك هەتاکوو دونیا مایە موسلمانان سەرۆکی بەمجۆرەیان بۆ هەلناکەویت ، بەمجۆرە ئیمامی عومەر بەدەستیئەم ناپاکە شەهیدکرا، خوا رووی ئەم ناپاکە رەش بکات هەروەکوو رەشی کرد ، ئیتر ( أم کلثوم ) خیزانی ئیمامیعومەرو کچی فاطمەی زەهراو کچی ئیمامی عەلیکوریئەبوطالیب ﷺ بە بیوەژنی مایەوە

کاتیك ( أم کلثوم) ﷺ کۆچیدواییکرد ، کورەکانی عبداللەی کوریعومەروکوری خۆی زەید نویژیان لەسەرکرد وچوار تەکبیرەیان بۆکرد

**خوای گەورە لەدایەنی بړواداری بەختەوەر کەوا خواکردی بە خیزانی ئەم زاتە پیرۆزە رازیبیّوئیمەوئەوانیش بە بەهەشتی بەرینی خۆی شاد بکات**

عن ابي وائل قال :
قال عبدالله بن عباس  وددت ان الله غفرلي ذنبا
من ذنوبي  وانه لايعرف نسبي .

واتـــــه :
ئاواتم ئەوەیە خوای گەورە لەگوناهێك
لەگوناهەکانم خۆش بێت ئیتر باکەس نەزانێت
کێم و کوڕی کێم.

ژمارەی سپاردن : ( ۳۵۱ ) ساڵی ۱۹۹۷